# شێوازی

# گفتوگۆکردن

برایان ترەیسی

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: کەلسوم عومەر

بەختیاری

- پێناسی کتێب
- ناوی کتێب: شێوازی گفتوگۆکردن
- نوسەر: برایان ترەیسی
- وەرگێڕانی: کەلسوم عومەر
- بابەت: هونەری گفتوگۆ
- چاپخانە: تاران
- چاپی یەکەم: ٢٠١٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٢٥٠٠

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ١٥٩٩) ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە


بەختیاری

# پێڕست

# پێشەکی

سەرکەوتنەکانت لە ژیانی کەسی و بازرگانیتدا بەگوێرەی توانای گفتوگۆکردنت دیاری دەکرێن لە هەموو بارودۆخەکاندا. گفتوگۆکردن ئەو بەهرە و کارامەییەیە کە کاریگەری هەیە لەسەر هەموو ئەو شتانەی دەیانلێیت یاخود ئەنجامیان دەدەیت، لە هەموو کارلێکە کەسی و بازرگانییەکانتدا. ئەگەر نەتوانیت بەباشی گفتوگۆ بکەیت لە هەموو دۆخێکدا، ئەوا بەشێوەیەکی خودکارانە دەبیتە قوربانی دەستی ئەو کەسانەی کە باشتر لەتۆ توانای گفتوگۆکردنیان هەیە. ئەگەر توانای گفوگۆکردنت باش بێت ئەوا دەبیتە کەسێکی سەرکەوتوو لە پیشەکەتدا و داهات و سەرمایەی زۆر زیاتر بەدەستدەهێنیت.

وەك کۆبونەوەیەکی ماوەدرێژی گفتوگۆکردن لە ژیان بڕوانە هەر لە ناو لانکەوە هەتاوەکو ناوگۆڕ، گفتوگۆکردن هەرگیز ناوەستێت یاخود کۆتایی نایەت. بەشێکی

سەرەکییە لە ژیانی بازرگانی و وتووێژکردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا. ڕێگایەکە کە تاکەکان بە نرخ و گرنگی جیاوازەوە بوار و ڕێگای دروستکەر دەدۆزنەوە بۆ ژیان و کارکردن و هاوگونجاندن لەگەڵ یەکتریدا. توانای تۆ بۆ گفتوگۆکردنێکی سەرکەوتوو زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتنت لە پەیوەندییەکانتدا لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

گفتوگۆکردن بەدرێژایی مێژوو بەردەوام بووە هەر لەسەرەتای دروستبوونی شارستانیەتەوە لەبەرئەوەی مرۆڤ هەمیشە حەزی بە پێشخستن و باشترکردنی بارودۆخی ژیانی خۆی کردووە.

هەمووکەس دەیەوێت کە شتی باش بەدەست بهێنێت: هەر لە دڵخۆشی، سەروەت، پلە و پایە، خۆشەویستی، پارێزراوی، پێگە و ئاستی بەرز، دەسەڵات و هەروەها سەرکەوتنیش. خەڵکی دەیانەوێت کە ئامانجەکانیان بە ڕێگایەکی خێراتر و ئاسانتر بەدەست بهێنن وە بە کەمترین کات و کەمترین تێچوو. هەر یەکێك لە ئێمە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە ململانێدایە لەگەڵ زۆرێك لە خەڵکی دیکەدا کە دەیانەوێت هەمان ئامانج و دەرئەنجام بەدەست بهێنن.

لــە ڕێگــەی لێکتێگەیشــتن و گفتوگۆکردنــەوە دەتــوانین هاوسەنگیی ململانێ و پێشبڕکێ ویستراوەکانمان بکەین، دڵنیابین لەوەی باشترین دەرەنجام بۆخۆمان دەستەبەر بکەین.

**نرخ و بەهاکان کەسین**

نرخ و بەهای هەموو شتێك هەمیشە و بەتەنها لەڕێگەی ئاستی ویست و خواستی باشی ئەو شتەوە دیاری دەکرێت. نرخ و بەهاکان لەو ڕێگەیەوە دیاریدەکرێن کە کەسێکی دیاریکراو، لەکاتێکی دیاریکراو و لەژێر چەند بارودۆخێکی دیاریکراودا، ڕەچاوی شتێکی پڕ بەها دەکات. لەبەرئەوەی ئەم جۆری نرخ و بەهایانە هەمیشە کەسین، ئەوا هەرگیز ناتوانین لە پێشتر بڕیاری نرخی گونجاو و کۆتا یاخود کۆمەڵە مەرجێکی بۆ بدەین. ئەو نرخ و بەهایەی کە خەڵکی ئارەزوو دەکەن بیدەن یاخود پەسەندی بکەن، هەمیشە دەکەوێتە سەر تاکەکان و بڕی ویست و پێویستییان لەکاتی مامەڵەکردندا.

ئەوە هەڵسەنگاندنی کەسییە کە دەبێتە هۆی دروستبونی ئاڵوگۆڕکردنی کەلوپەل، خزمەتگوزاری، پارە وە شتەکانی

دیکەش. لە هەموو مامەڵە و بازرگانییەکدا لایەنە بەشداربووەکان تەنها کاتێك لەسەر نرخ و مەرجەکان ڕێکدەکەون کە بڕوایان بەوە هەبێت شتێکی باشتریان دەستدەکەوێت لەوەی ئەگەر ئەم مامەڵەیان نەکردایە. وەك دەڵێن" ئەوە سەرنج و بیروڕای جیاوازە کە پێشبڕکێ و ململانێ دروست دەکات".

رێگە و شێوازە کردارییەکان

بەدرێژایی چەندین ساڵ، بڕی ملیۆنان دۆلار گفتوگۆی بەڵێننامەم کردووە بۆ بوارەکانی نیشتەجێبوون، بازرگانی، پیشەسازی خانووبەرە، کە پێکهاتووە لە بینای بازاڕکردن، نوسینگە و پەرەپێدانی زەوی و زار. گرێبەستی زیاتر لە (٢٥)ملیۆن دۆلارم کردووە بۆ هاوردەکردن و دابەشکردنی ئۆتۆمبێل. لەگەڵ ڕێکەوتننامە بۆ چاپەمەنی، ڕاوێژکاری، بازرگانی، بانگەشە، کۆنگرە و کۆبوونەوەکان، وە فرۆشتنی هەزاران بابەت بە بڕی ملیۆنان دۆلار.

بیرۆکەکانی ناو ئەم پەرتووکە لەسەر بنەمای ئەزمونێکی زۆر دانراوە، بە هەردوو ئەزموونی باش و خراپیش لەگەڵ توێژینەوەی چەندین ساڵە لەسەر زانست و هونەری

گفتوگۆکردن. هەریەك لـەم بیرۆکانـە کـرداری، سـەلمێنراو، خێـرا جێبـەجێکراو و زۆر بەسـودن. وات لێدەکـەن کـە باشترین ڕێکەوتن ئەنجام بدەیت لە هەموو بار و دۆخێکدا. لـە سەرانسـەری جیهانـدا ئـەم بیرۆکانـەم فێـری سـەدان و هـەزاران بازرگـان و خاوەنکـار کـردووە، وە دەرئەنجامـە ئەرێنییـەکانی کـە بەدەسـتیان هێنـاوە لـە گفتوگـۆکردن بونەتە هۆی گۆڕینی ژیانیـان. ئەگـەر بەشـێوەیەکی رێـك و پێك تەنها کەمێك لەوەی فێری دەبیـت جێبـەجێی بکـەیت، ئەوا دەتوانیت بەرەوپێشچوونێکی مەزن بەدەسـت بهێنیـت لە چۆنیەتی و چەندێتی دەرئەنجامەکانت.

## گفتوگۆکردن شایستەی فێربوونە

تەنانەت منداڵێکی بچوکیش گفتوگۆ دەکات. وادەزانـن کـە لەئامێزگرتنێك و نازپێدانێکی کـەم پاداشـتی ئـەو شـتانەیە کە لەگەڵ دایك و باوك و ناسراوەکانیاندا گفتوگۆی دەکەن. گفتوگـۆکردن (یـاخود نـەکردن)، ڕەزامەنـدی دوولایەنـە (یاخود ناڕازیبوون) وە کـارکردن بـۆ پێکهێنـانی ململانـێ،

ئـەم چـالاکییانە بەشـێکی سـەرەکی و گـرنگن لـە ژیـانی مرۆڤدا.

تواناکەت بـۆ گفتوگـۆکردنێکی بـاش (وەك گفتوگۆکـەرێکی لێهاتوو) دەکرێت جیاوازییەکی زۆر گەورە دروست بکات لە ژیـانی سـەرمایەداری و کارەکەتـدا وە لەپەیوەندییەکانتـدا وە لەهــەموو ئــەو شــتانەی کــە وەری دەگریــت یــاخود دەیانبەخشــیت لــە ژیــانی ڕۆژانەتــدا. خۆشــبەختانە، گفتوگــۆکردن بەهرەیــە وە هــەموو بــەهرە و کارامەییــەك دەکرێــت فێــری ببیــت. هــەموو ئەوانــەی کــە ئــەمڕۆ گفتوگۆکارێکی زۆر باشـن ئـەوا ڕۆژێـك لـە ڕۆژان زۆر خـراپ بـوون و لـە کۆتـایی دا توشـی مامەڵـەو ڕێککـەوتنی خـراپ بــوون زیـاتر لــەوەی ئــەمڕۆیان. هــەتا زیـاتر فێرببیــت، بیربکەیتـــەوە و مەشـــقی گفتوگـــۆکردن بکـــەیت ئـــەوا گفتوگۆکـارێکی باشـترت لێدەردەچـێت. هـەر کـە توانیـت دەرئەنجامێکی باشتر بەدەست بهێنیت، ئەوا زیـاتر هەسـت بە دڵخۆشی و باوەڕ بەخۆبوون دەکەیت لە ژیانتدا.

یـەکێك لـە بـەهێزترین ڕێگاکـان کـە فێـری دەبـین ئەوەیـە جیاوازی بکەین لـەنێوان ئـەوەی ئـەنجامی دەدەیـن لەگـەڵ

ئەوەی کەوا باشترە ئەنجامی بدەین. بیر لـەبوارێکی گـرنگ بکەرەوە لەژیانی کەسی و کارەکەتـدا کـە تێیـدا گفتوگـۆت کــردووە. کاتێــك ئــەو پەرتوکــە دەخوێنیتــەوە بیرلــەوە بکەرەوە کـە دەبێـت چـۆن مەشـقی ئـەو ڕێگـە و شـێوازانە بکــەیت بــۆ بەدەســتهێنانی دەرئــەنجام و ســەرەنجامێکی باشـتر لـەوەی کـە ئـەمڕۆ بەدەسـتتهێناوە. هـەر کـە ئـەم بیرۆکانەت کرد بە کردار، ئەوا سەرسام دەبیت بـەوەی کـە گفتوگـۆکردن کـارێکی چـەندە باشـە و لـە کۆتایـدا چـەندە دڵخۆشتر دەبیت.

# بەشی یەکەم
# هەموو شتێك شایستەی گفتوگۆلەسەرکردنە

"هـەموو شـتێك شایسـتەی گفتوگـۆ لەسـەر كردنـە". ئـەم ڕستەیە پێویسـتە لەئێسـتە بـەدواوە ببێتـە ڕێچكەیەك بـۆ ژیـــان و بازرگانییەكـــەت. یـــەكێك لـــە گـــەورەترین بەربەســـتەكانی ســـەركەوتن و دڵخـــۆش بـــوون سســـتی و لاوازییـــە. كەســـانی لاواز و نـــەرێنی بـــارودۆخ و كێشـــەكان پەســـەند دەكـــەن، وە هەمیشـــە هەســـت بـــە بێدەســـەڵاتی دەكەن لە ئاست گۆڕینی بارودۆخەكەدا. لەلایەكی دیكـەوە، كەسانی چالاك و چاپوك، لە هەموو كات و شوێنێكدا ئەگەر و دەرفـەت دەدۆزنـەوە، وە هەمیشـە لـەوە دەگـەڕێن كـە بارودۆخەكـە بـۆ بەرژەوەنـدیی خۆیـان بگـۆڕن. پێویسـتە ئەمە شێوازی تۆش بێت.

وەك گفتوگۆكەرێك بیر بكەرەوە

بڕێکی زۆر کەم لەنرخی جـێگیر هەیـە لەسـەر هـەر شـتێك، تەنانەت ئەگەر نوسراو وە یاخود چاپکراویش بن. پێویستە هەمیشە ئەوەت لەبیربێت کە کێشە نییە نـرخ و مەرجـەکان چەندە جێگیر یاخود ناجێگیربن، هەموو شـتێك شایسـتەی گفتوگۆلەسەرکردنە. کاری تۆ ئەوەیـە بەسـادەیی بتوانیـت ئـــەوە بدۆزیتـــەوە کـــە چـــۆن وە لـــەکوێ دەتوانیـــت ڕێککەوتنێکی باشـتر بەدەسـت بهێنیـت باشـتر لـەوەی کـە پێشتر پێشکەشت کراوە.

٦٠٠٠سـالْ بـەر لـە ئێسـتا بـۆ یەکـەمجار سـۆمەرییە کۆنەکانـەوە دەسـتیانکرد بـە ئـالْوگۆڕی بازرگـانی کـردن. بەشێوەیەکی گشتی وا تێگەشـتبوون کـە هـەموو نرخـەکان دەکرێـت گفتوگۆیـان لەسـەربکرێت. لـە هـەموو ولاّتـانی جیهاندا لەبازاڕ و فرۆشتگاکاندا، تەنانەت لە بازاڕی لەنگە و مەزادخانەکانیشـدا، لەگـەراجی کۆلاّنەکانیشـدا، هـەموو نرخەکان _ فرۆشتن یاخود کڕین _ تاکە خالْی دەسـتپێکن بۆ گفتوگۆکەرە باشەکان کە دەست دەکەن بە دۆزینـەوەی باشترین نرخـی گونجـاو. بـەلاّم لەشـوێنی دیکـە و لـەبازاڕە مۆدێرنەکاندا گفتوگـۆکردن هانـدراو نییـە. لەلایـەن کۆمەلْـە

خەڵکێکــەوە دیــاریکراوە، بەتایبــەتی ئەوانــەی کــە بەرهەمەکانیان لە بازاڕەکاندا دەفرۆشن پێویستە بە هەموو شێوەیەك لێیان دوور بیت. لـەبری ئـەوە، خـەڵکی لیسـتی نرخــەکان لەســەر خزمــەتگوزاری و بەرهەمــەکانیان چــاپ دەکەن و پێشکەشی تۆی دەکەن وەك ئەوەی کە بـە بـەرد نەخشـێندرا بێـت. بـەڵام نرخێکـی نوسـراو هـیچ واتایـەك ناگەیەنێت. ئەوە ڕاستییەکی جـێگیر و نـەگۆڕ نییـە، ئـەوە تــەنها باشــترین خەمڵانــدنی کەسـێکە، لــە شــوێنێك کــە کەســەکە چــەندەی پێــدەدرێت هــەر نرخێــك لەلایــەن کەسێکەوە دابنرێت دەکرێت لەلایەن ئـەو کەسـەوە یـاخود کەسێکی دیکەوە بگۆڕدرێت.

**نرخەکان شتگەلێکی لەخۆوەن**

ڕاستییەکە ئەوەیە کە هەموو نرخەکان لـەخۆوە دادەنـرێن. بازرگانــەکان نرخــەکانیان لەســەر بنچـینەیەکی ئازادانــە و لــەخۆوە دادەنـێن بـەپێی تێچـوو، قـازانجی پێشـووتر، وە ســـنوری ململانێکانیـــان. لەدەرئەنجامـــدا، بـــەگۆڕینی زانیارییەکان هـەموو نرخـەکان دەکرێـت بگـۆڕدرێن و چـاك بکـرێن بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان. هـەرکاتێك دەربـارەی

فرۆشتن شتێکت بینی وەك بەرزکردنەوەی نرخێکی نزم ئەوا نمونەی ئەو کۆمپانیایەت دێتە بەرچاو کە یەکەم جار نرخەکانیان داناوە و بە هەڵە خەملاندنیان بۆ کردووە.

پێویستە پەرە بەو ڕەفتار و خووەت بدەیت کە کێشە نییە نرخی داواکراو چەندە لەو کاتەدا، دەتوانیت ئەم ڕێککەوتنە بەرەوپێش ببەیت بە شێوەیەك کە خۆت ئارەزووی دەکەیت. ڕەنگە بتوانیت کە کامەی هەرزانتر و خێراترە یاخود باشترە بەدەستی بهێنیت. ئەمە بکە بە خوویەك بۆئەوەی بەبەردەوامی بەدوای هەلی زیاتردا بگەڕێیت بۆ باشترکردنی نرخ و مەرجەکان بە هەرشێوەیەك بێت.

## بەڵێننامەکان خاڵی دەستپێکن

بۆنمونە کاتێك بەلێننامەیەك یاخود ڕێککەوتنێکت پێشکەش دەکرێت، ئەوا بەتەواوی دەسەلاتی ئەوەت هەیە کە هەموو ئەو مەرج و خالانەی بەدڵت نییە دەربکەیت یاخود پێداچونەوەیان بۆ بکەیت. ئاگاداری ئەو بەڵێننامانە بە کە لەلایەن فرۆشیارێك یاخود کەسێکی دیکەوە

پێشکەشت دەکرێت ئەوا لەلایەن فرۆشیارەکەوە نوسراوە و لە سودی ئەو نوسراوە لەم بەڵێننامەیەدا بەشێکی یەکجار کەم بۆ تۆ هەیە. هەرگیز خۆت بەو شتانە مەترسێنە کە بەڵێننامە و ڕێککەوتنامەکانی فرۆشتن نوسراو و جێگیر و نەگۆڕن.

چەند ساڵێك بەر لە ئێستا، کرێنامەمان لەسەر شوێنی بینای نوسینگەیەك لابرد. هەرچەند ساڵێك دوای ئەوە، خاوەن بیناکە، نوسینگەکەی فرۆشت بە کۆمپانیایەکی دیکە. بەڕێوبەرە تازەکانی موڵکەکە سەردانی هەموو کرێنشینەکانیان کرد و ئەوەیان ڕوونکردەوە کە بە چەند هۆکارێکی یاسایی دەبێت هەموو کرێنشینەکان ڕێککەوتنی کرێنامە تازەکە واژۆ بکەن لەگەڵ خاوەنە تازەکەدا. ئێمە دەمان وت، پێویست ناکات دوودڵ بن سەبارەت بە هیچ شتێك. پێدەچێت کرێنامەکە کەمێك زیاتر یاخود کەمتر بێت وەك لە کرێنامە بنەڕەتییەی کە پێشتر واژۆمان کردبوو، تەنها چەن شتێکی لاوەکی لێ گۆڕدراوە.

کاتێك کە کرێنامە نوێیەکەمان بەدەست گەیشت هەتاوەکو واژۆی بکەین، دە لاپەڕە زیاتری هەبوو لە کرێنامە

بنەڕەتییەکە. هاوڕێیەکم کە پسپۆڕی نوسینگەی کرێنشـین بوو، پێداچونەوەیەکی بۆ کرێنامەکە کرد و بینی کە پـەنجا و دوو خاڵی زیادکراو یاخود کەمکراوی هەیـە بەبـەراورد بـە کرێنامـــە بنەڕەتییەکـــە! وە هەریـــەکێك لەوانـــە زۆر زەرەرمەنـدبوو بـۆ بازرگانیەکـەی ئێمـە. ئێمـەش کـارێکی سـادەمان کــرد. پێداچــونەوەمان بەهــەموو ڕێککــەوتنی کرێنامەکەدا کرد هـەر پـەنجا و دوو خاڵەکـەمان بـۆ دیـاری کـردن و لامـان بـرد لەپاشـان کرێنامەکـەمان نـاردەوە بـۆ خاوەن بیناکە. لە پاش چەند ڕۆژێك هاتنەوە بـۆ لامـان بـە ڕێککەوتننامەیەکی ڕێـك و پێکـەوە هـەروەك ئـەوەی ئێمـە چـاکمان کردبویـــەوەو داوامـــان کردبـــوو. ئـــەوەی لـــەم چـیرۆکەوە فێـری دەبـین ئەوەیـە: هــەرگیز ڕێگــە مــەدە بتۆقێنــدرێیت لەلایــەن خــاڵ و مەرجــەکانی هــەر کــار و ڕێککەوتنێکی کڕین و فرۆشتنەوە. کێشە نابێت کە ئـەوانی تر چـی دەڵـێن یـاخود چـی دەنوسـن لـە ڕێککەوتنەکـەدا، هەموو شتێك دەکرێت گفتوگۆی لەسـەر بکرێـت. هەرلەبـەر ئەمەیە ڕێککەوتنامە یەکەم هەنگاوی پڕۆسەکەیە.

# بەشی دووەم
# زاڵبە بەسەر ترسی گفتوگۆکردنتدا

کلیلـی گەیشـتن بـە ڕێکـەوتنێکی باشـتر زۆر ئاسـانە. داوا بکــە، داوای نرخــی کــەمتر بــۆ خــاڵ و مــەرجی باشــتر بکـــە.داوای پێداچـــونەوە و گۆڕانکـــاری بکـــە لـــە ڕێککەوتنامەکـەدا. داوای شـتی زیـاتر و داشـکاندن بکـە، یـاخود داوا بکـە کـە بەرهـەم و خزمـەتگوزاریی دیکـە زیـاد بکەن، وەك بەشێك لە ڕێکەوتنامەکە. بەڕووخۆشییەوە داوا بکە. بەچاوەڕوانکراوییەوە داوا بکە. بەباوەڕەوە داوا بکـە. بەڕەوشت و خۆشییەوە داوا بکە. وە ئەگەر زانیت ئەوەیان سودی نابێـت ئـەوا دەبێـت بەشـێوەیەکی ڕەق و تونـد داوا بکـەین. بـەلاّم هەمیشـە دەبێـت بـەڕوونی و تـەواوی داوای ئـەوە بکـەیت کـە دەتـەوێت. هەمیشـە بڵـێ بۆچـی؟ ئـەی بۆچی نا؟ داهاتوو بۆ ئەوانەیە کە دەپرسن. داهـاتوو تـەنها بۆ ئەوکەسانەیە کە بەبوێری و باوەڕەوە داوای ئـەو شـتانە

دەکەن کە دەیانەوێت، دیسانەوە داوا دەکەن وە بـەردەوام دەبن لەسەر داواکردن.

ئەگەر ئـەم ئامۆژگارییـە زۆر سـادەیە، ئـەی کەوایـە بۆچـی تەنها چەند کەسێکی کەم هەنگاو دەنێن بۆ داواکردنـی ئـەو شتانەی کە دەیانەوێت؟ ئەمە بۆ زۆرێکمان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵیمان. ئەمە هەمیشـە هـەڵقوڵاوی ترسـە لـە نەویســتن و ڕەتکردنــەوە لــە ئــەنجامی ڕەخنــەلێگرتن و نەبوونی خۆشەویستی کە زۆرێك لـە منداڵـەکان وەك منـداڵ مامەڵـەیان لەگـەڵ دەکرێـت. کاتێـك منداڵـەکان ئـەزموونی تـەواوی ژینگـەی دەوروبـەریان نەکـەن لـە مـاوەی تەمـەنی منداڵیاندا، ئەوا بەجۆرێك گەورە دەبن کە باوەڕ بـەخۆبوون و ڕێزی خودییان کەم دەبێت. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کـە وایان لێدەکات وابیر بکەنەوە شایستەی لەوە باشترنین کـە پێشکەشیان کراوە.

ئەم ترسە لە ڕەتکردنەوە دەکرێت وابکـات لـە خـەڵکی کـە بکشــێنەوە و شکســت بهێــنن لــەژیانی هەرزەکارییانــدا. هەمیشە ئەو ڕێککەوتنامە و مەرجانـە پەسـەند دەکـەن بـۆ کـارکردن، نرخـەکان = هــەردووك کـڕین و فرۆشـتن= کـە

قازانجێکی زۆر کەمی بۆیان هەیە لەوەی خۆیان دەتوانن بەدەستی بهێنن، ئەمەش تەنها لەبەرئەوەی دەترسن لەوەی کەسێك بڵێت نەخێر. دەتوانیت زاڵ ببیت بەسەر ترسدا ئەویش بەئەنجامدانی کردارێکی دژ بەو ترسەت. ئەگەر ترست هەیە لە ڕەتکردنەوە و نەویستن وە تۆش مەرج و خاڵەکانی ڕێککەتنێك قبوڵ بکەیت، ئەوا دەتوانیت بەسەر ئەو ترسەدا زاڵ بیت بەوەی کە بەردەوام داوای ڕێکەوتنی باشتر بکەیت و هیچ گوێ نەدەیت کە کەسی بەرامبەرت بڵێت "نەخێر". بەبەردەوامی ئەمە ئەنجام بدە، ئیدی ترسەکەت هەربەزووی نامێنێت و بزر دەبێت. ئەمە پرۆسەیەکە پێی دەوترێت"نەهێشتنی هەستیاریی" ئەمەش بریتی یە لە بەرەنگاربونەوەی ترس و بەبەردەوام ئەنجامدانی ئەو شتەی کە لێی دەترسیت، هەتا واتلێدێت لەکۆتاییدا ترسەکەت نامێنێت و زاڵ دەبیت بەسەریدا.

هەروەك چۆن ترس تەنها خوویەکە، ئەوا بوێریش بەهەمان شێوە خووە. بەزۆرکردن لەخۆت تاوەکو ئازایانە کردار بکەیت، بەتایبەتی لەداواکردنی نرخ و مەرجی باشتر لە

گفتوگۆکردندا، ئەوا تۆ بەڕاستی و دروستی باوەڕبەخۆبونت و ڕێزی خودیت بونیاد دەنێیت.

کار و پیشە ئازایەتی بونیاد دەنێت

یەکێك لە گرنگترین وانەکانی ژیانم کاتێك فێربوومك ە دەستم بەکاری فرۆشتن کرد لە ماڵ بۆ ماڵ (دەرگا بۆ دەرگا) و کاتژمێر لەدوای کاتژمێر. لە سەرەتادا زۆر زیاتر لەوەی چاوەڕێم دەکرد ڕەتکرامەوە. لە ڕاستیدا لە هەر دەرگایەکم دەدا، داخرابوو بە ڕوومدا، تا لە کۆتایدا بۆم دەرکەوت کە من تەواو ڕەتکراومەتەوە و پێیان دەوتم کە حەزیان بە بەرهەمەکانم نییە و نایانەوێت. سەدان و هەزاران جار گوێم لە وشەی "نەخێر" بوو. تاکو پاشان ڕۆژێك لە پیاوێکی فرۆشیاری بەئەزمونم پرسی کە ئایا چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم ڕەتکردنەوە بەردەوامە دەکات. ئەویش ئەم چەند وشە جادوویيانەی پێوتم: "ڕەتکردنەوە شتێکی کەسی نییە".

هەرگیز ڕەتکردنەوە بە کارێکی کەسی وەرمەگرە. کاتێك کەسێك دەڵێت "نەخێر" بۆ پێشنیارێکت لە گفتوگۆکردنێکدا، ئەوا ئەمە ڕەتکردنەوە و

بەرپەرچدانەوەی تۆ و نرخی کەسیت نییە. ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ کەسێکی باش یاخود خراپیت. هەرچەندە ئەو کەسە بڵێت "نەخێر" ئەوە شتێکی ئاساییە و تەنها وەڵامێکی بازرگانییە بەجۆرێك لە جۆرەکان. هیچ پەیوەندییەکی بە تۆوە نییە. بەشتێکی کەسی وەریمەگرە.

هەر کە ئەم بیرۆکەیە فێربووم. بووم بە ئامێرێکی فرۆشتن. زۆر بەباوەڕ بەخۆبوونەوە دەچومە بەردەرگای ماڵەکان و داوام لە خەڵکەکە دەکرد کە بەرهەمەکانم بکڕن. کێشە نییە کە چەند گوێم لە وشەی "نەخێر" دەبوو، من تەنها پێدەکەنیم بە ڕوویاندا. بۆم دەرکەوت ئەو کەسەی دیکە بەو شێوەیە بیر لە من ناکاتەوە. بەڵکو ئەو شتەی کە من پێشکەشی دەکەم جیاوازە لەوەی کە ئەو خوازیارێتی و دەیەوێت هەر لەبەر ئەمەیە کە دەڵێت "نەخێر". کەواتە هەرگیز ڕەتکردنەوە شتێکی کەسی نییە.

**بونیادنانی ئیمپراتۆریەتێك**

یەکێك لە بەژداربووانی کۆڕەکانم کرێکارێکی بیناسازی سیمرخی بوو کە بڕیاری دابوو خانووە کۆنەکان بکڕێتەوە

و بەکرێیان بدات تاوەکو بتوانێت بارمتەی خانووبەرەی پێ بدات و لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك قازانج بکات. بەلاّم پارەی تەواوی پێنەبوو تاوەکو دەست بەکاربێت، بۆ ئەم مەبەستەش، دەستی کرد بە گەڕان بەناو ڕۆژنامەکاندا بۆ ئەو خانوانەی کە دانراون لەبازاڕدا لەلایەنی خاوەنەکانیانەوە نەوەك ئەوانەی کە لەلایەن بریکاری خانووبەرە دانرابوون. دەستی کرد بەپەیوەندی کردن بە خاوەن خانوەکانەوە و ڕێکخستنی کاتێك بۆ سەیرکردنی خانوەکان، لەپاش ئەوەی کە بیزانیایە ئەو خانووە باشە بۆ فرۆشتن، چاککردن و بەکرێدان ئەوا دەگەڕایەوە بۆلای خاوەنەکەی و لە ٥٠٪ ی ئەو نرخەی پێدەدا کە داوای کردبوو. هەندێك لە خاوەن خانوەکان تووڕە دەبوون. هەندێکیان شێتگیر دەبوون. بەلاّم لەنێوان هەموو ئەو بیست خاوەن مالاّنەی کە پەیوەندی پێوەکردن، تەنها یەك کەس لەوانە توشی کێشەیەك بوو بوو لەژیانیدا وە وای کرد کە خانووەکەی بفرۆشێت. کەسانێك هەن کە بازرگانییەکانیان شکستی هێناوە، یاخود کارەکەیان لەدەستداوە، یاخود لە هاوسەرەکانیان جیابونەتەوە

یاخود مایەپوچ بوون ، وە یاخود بڕیاریانداوەماڵەکەیان بگوێزنەوە بۆ شوێنێکی دیکە. تەنها شتێك کە ڕێگرە لەبەردەم ئەم کارەیاندا فرۆشتنی خانووەکەیانە.

بەم هۆیەوە، بۆ هەموو نۆزدە ڕەتکردنەوەیەك، کەسێك موڵکەکەی لە مەزاد دانابوو لە٦٠ ٪ بۆ لە ٧٠٪ کەمتر لە نرخی داواکراوی خۆی، وە خاوەن موڵکەکە لە کۆتایدا ڕازی بوو. لەپاش چەند ساڵێکی کەم لە گوێبیست بوونی وشەی "نەخێر" بەبەردەوامی، کرێکارەکە بووە خاوەنی چل و دوو خانوو وە مانگانە زیاتر لە (١٠٠٠٠) دەهەزار دۆلاری دەست دەکەوت. وا خەریکە لە ڕێگای بوون بە ملیۆنەر نزیك دەبێتەوە. وە هەموو ئەمانەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە نەترسا لە گوێبیستبوونی وشەی "نەخێر" بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە دەیەوێت.

## گفتوگۆکردن وەك یارییەك

وەك یارییەك بیر لە گفتوگۆکردن بکەرەوە. شتێکی هەتەر و جددی نییە، بابەتی ژیان و مردن نییە، ئەوە تەنها جۆرێکە لەیاری. لە ڕاستیدا، یەکێکە لە گەورەترین یارییەکانی ژیان. کاری تۆ ئەوەیە کە بتوانیت کە بە

**شێوەیەکی کارامە یارییەکە بکەیت و پاشان باشتر و باشتر بیت تێیدا.**

**گفتوگۆکەرە ئاست بەرزەکان سوورن لەسـەر گفتوگـۆکردن لـــە هـــەموو بارودۆخێکـــدا. هەمیشـــە چـــەند و چـــون و سەوداگەری دەکەن چونکە ئەم کارە بۆ ئەوان جۆرێکـە لـە خۆشـی بیـنین. کاتێـك وەك چـالاکییەکی چـێژبەخش لـە گفتوگۆکردن دەڕوانیت بە هێمن و ڕووخۆش و باوەڕ بـەخۆ بـوو دەمێنیتـەوە، ئـەوا لـە هـەموو لایەنێکـەوە دەرفـەتی گفتوگۆکردنـت دەبێـت، بۆئـەوەی بـە هـەر کوێیـەك کـە دەتـــەوێت بگـــەیت، وە یـــاخود هەرشـــتێك کـــە دەتـــەوێت بەئەنجامی بگەیەنیت.**

# بەشی سێهەم
# جۆرەکانی گفتوگۆکردن

دوو جـۆر لـە گفتوگـۆکردن هەیـە. کـە هەریـەکێك لەمانـە ئامانجی جیاواز و دەرئەنجامی ویستراوی جیاوازیان هەیـە. بـەڵام کێشـەکە تـەنها ئەوەیە کـە زۆربـەی کـات لـە هـزری کەسـی گفتوگۆکـەردا تێکـەڵ دەبـن، وە مـل دەنێـت بـۆ دەرئەنجامێکی خراپتر لەوەی کە دەتویست پێی بگەیت.

یەکەم جۆری گفتوگۆکردن، یاخود جۆری(I)من پێی دەڵێم "شـێوازی یـەکجار". لـەم بارودۆخـەدا تـەنها بەرنامـەت ئەوەیـە کـە گفتوگـۆکردن و مامەڵـەکردنت لەگـەڵ لایـەنی بەرامبـەردا تـەنها بـۆ یـەك جـارە و، هـەرگیز دووبـارەی ناکەیتـەوە. هـەر لایـەنێك لـە گفتوگۆکردنەکـە تـەنها یـەك ئامانجی هەیە: ئەویش ئەوەیە کە بەرزترین یاخود نـزمترین نرخ بەدەست بهێنن، وە باشترین هەل و مەرج بۆ ئەم کڕین و فرۆشتنە دەستەبەر بکەن.

هیچ شتێك کۆت و بەندت نەکات

لـه گفتوگـۆکردنی جـۆری(I)، لـه بـارودۆخێکی دژ یەکـدان لەگەڵ لایەنی بەرامبەردا. ئامانجی کەسی بەرامبەر ئەوەیـە کە ئەگەر شتت لـیَ بکڕێـت کـەمترین نرخـت پـێ بـدات، وە ئەگەر شتت پێ بفرۆشێت زۆرترین نرخت لێوەربگرێت. ئەو کەسە هاوڕێت نییە گرنگ نییە کە چەندە بەڕێزە لەگەڵت و زەردەخەنە دەکا بە ڕووتدا لەکاتی گفتوگۆکردنەکەدا، ئـەو تەنها بیر لە خۆی و بەرژەوەنـدی خـۆی دەکاتـەوە. گـرنگ نییـە بەلایـەوە کـە لـە کۆتـایی ڕۆژەکـەدا پارەیـەکی زۆرت دابێت وە یاخود پارەیەکی کەمت دەست کەوتبێت.

لـەم جـۆرەی گفتوگۆکردنـدا، دەبێـت زۆر هـێمن، لێـزان و خۆپەرست بیت. دەسەڵاتی تەواوت هەیـە بـۆ بـەکارهێنانی هەر مانۆڕو فێڵێکی شیاو، تـاوەکو گونجـاوترین ڕێککـەوتن بەدەست بهێنیت. هەر کە ئەم مامەڵەکردنە بـە کۆتـا هـات، پێویستە وای دابنێیت کە جـارێکی تـر ئـەو کەسـەی دیکـە نابینیتەوە. گرنگ نییە کە ئـەو کەسـەی دیکـە تـۆی بـەدڵ بێت، ڕێـزت بگرێـت وە یـاخود بیـەوێت ببێـت بـە هاوڕێـت. ئـەوەی گرنگـە تـەنها ئەوەیـە کـە تـۆ بتوانیـت باشـترین مامەڵەی گونجاو ئەنجام بدەیت.

له بەشەکانی دواتردا فێری زنجیرەیەك لـه ڕێگـا و شـێواز و تــەکنیك دەبیــت کــە دەتــوانی بــەکاری بهێنیــت بــۆ بەرزکردنـــەوەی ئاســـتی ســـەرکەوتنت لـــەم جـــۆرەی گفتوگۆکردندا.

## گفتووگۆی درێژخایەن

دووەم شـێوازی گفتوگـۆکردن بریتییـه لـه گفتوگـۆکردنی درێژخایەن، یاخود جۆری(II). ئەمـه لـه کاتێکدایـه بچیته ناو ڕێککەوتنێکی ئـالۆزترەوە کـه پێویسـته لـه ماوەیـەکی دیـاریکراودا بەئـەنجام بگەیەنـدرێت. لـەم دۆخـەدا بـەهۆی سروشـتی بەرهەمـەکان و خزمەتگوزارییـەکان، بەڵێننامـه و ڕێکەوتنەکان له ژێر گفتوگۆکردندا، ڕەنگه وابکـات کـه کـار لەگەڵ هەمان کەس و دامەزراوەدا بکەیت بـۆ مـاوەی چـەند مانگێك یاخود چەند ساڵێك له داهاتوودا.

سـی سـاڵ بـەر لـه ئێسـتا، کاتێـك دەسـتمکرد بـه بەرهـەمهێنانی بەرنامـەی دەنگـی و ڤیـدیۆیی لەگــەڵ پیشـەگەرێك لـه شـیکاگۆ، سوپاسـگوزار بـووم بۆئـەوەی کۆمپانیایـەك بەرهەمـەکانم لـه بازاڕەکـانی نـاوەوە و

دەرەوەی وڵات بڵاوبکاتەوە. وە خۆشبەختانە، کۆمپانیاکە چەند هەل و مەرجێکی خستە بەردەستم کە گونجاو و ستاندارد بوون بۆ پیشەکەم. ئێستا و لەپاش سی ساڵ، هێشتا لە نزیکەوە کار لەگەڵ ئەو کۆمپانیا و کەسانەدا دەکەم لەو دامەزراوەدا هەر لە سەرۆکی کۆمپانیاکەوە تاوەکو بەردەستەکانی.

پاش تێپەڕبوونی دەیەیەك، بازاڕ گۆڕدرا، زۆرێك لە خەڵکی هاتن و ڕۆیشتن، وە بەرهەمی زیاتر خرانە بازاڕەوە و بڵاوکرانەوە و لە کۆتایشدا نەمان. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا پەیوەندییەکانی من لەگەڵ کەسە گرنگەکانی ئەو بازرگانییەدا هەمیشەیی و دۆستانە، و پڕ لە ڕێز و قسەی خۆش و پیشەگەرانە بووە. لەبەرئەوەی هەمیشە لە پەیوەندییەکانمدا بە شێوەیەکی باش مامەڵەم کردووە، وە بووەتە هۆی بەدەستهێنانی دەرفەتی باشی بازرگانی و دەرئەنجامی باش لە ژیانمدا.

**بەڵێننامەی چینی**

چەند ساڵێك لەمەوبەر دەستمکرد بە بەکارهێنانی ئەم شێوازە، سەدان و هەزاران لە جێبەجێکار و بازرگانم

فێرکردووه، کە بەشێوەیەکی بەردەوام بەکاریان هێناوە و دەرئەنجامی نایابیان هەبووە. با سەرەتا بە تێگەیشتن لە جیاوازی نێوان ڕێککەوتنی ستانداردی ڕۆژئاوایی و ڕێککەوتنی چینی دەست پێبکەین.

لە رۆژئاوادا، کاتێکی یەکجار زۆر تەرخان دەکرێت بۆ گفتوگۆکردنی چاپکردنی بەڵێننامەکە. "لایەنی یەکەمی ئەم ڕێککەوتنە دەبێت بەم شێوە بێت... لایەنی دووەمی ئەم ڕێککەوتنە بەم شێوە بێت...".لە کۆتاییدا ئەم بەڵێننامەیە دەبێتە بنچینەی پەیوەندییەکانی بازرگانییەکە. هەر لایەنێك دەبێت ڕەچاوی وشە بە وشەی خاڵەکانی رێککەوتنەکە بکات و پێی ڕازی بێت. هەر لایەنێك لە خاڵە نوسراوەکانی ڕێککەوتننامەکە دەکرێت ببێتە هۆی تێکچوون و ناکۆکی و سزادان. لەکلتوری چینی دا، کاتێك ڕێکەوتنێکی باش ئەنجام دەدەیت، ئەوا هەموو مەرج و خاڵەکانی ڕێکەوتنەکە گفتوگۆ و وتووێژی لەسەر دەکرێت و پاشان پەسەند دەکرێن. لەپاشان لەسەر کاغەز دەنوسرێت و پێداچونەوەی بۆ دەکرێت و لەکۆتایدا

لەلایـــەن هـــەردوو لایـــەنی بـــەژداربووەوە واژۆی لەســـەر دەکرێت.

لە بەڵێنامـەی ڕۆژئاواییـدا ئـەم هـەنگاوە کۆتـایی وتووێـژ و گفتوگۆکردنەکانــە. بــەلاَم لــە بەڵێننامــەی چــینیدا ئەمــە سەرەتا و دەستپێکی هەموو وتووێژ و گفتوگۆکردنێکە. لـە هۆشبەندی چینی دا، هەرشتێك کە پێشبینی دەکرێت ئـەوا دەنوسرێت. بەلاَم هەمیشـە تێگەیشـتنێکی ڕوون هەیـە کـە هەرچەندە ڕێککەتنامەکە بەرەوپێش بـڕوات، ئـەوا زانیـاری نویَ و بارودۆخی لەپڕ ڕەنگە بێتـە پێشـەوە. پێویسـتە بـۆ ئــەم زانیارییــە نوێیــە و ئــەم بارودۆخــە پێداچــونەوە بــۆ ڕێکەوتننامەکە بکرێت بە جۆرێك کە هێشتا بەسود بێت بـۆ هەردوو لایەنەکە.

هــەرکاتێك گفتوگــۆم کردبێــت لەگــەڵ هــەر لایەنێکــدا( وە ڕێکەوتنم لەگەڵ زیاتر لـە کڕیـاری شەسـت وڵاَت کـردووە). ئـەوا هەمیشــە لــە دوو لاپــەڕەدا کۆتاییمــان بــە ڕێکەوتنــە جۆراوجۆر و ئاڵۆزەکان هێناوە کە نرخەکەی هـەزاران دۆلار بووە. هەر لەسەرەتاوە دەڵێم " با ڕێکـەوتنێکی چـینی لـە نێوان خۆماندا بکەین. لـەم جـۆرە ڕێکەتنـەدا هـەردوولامان

ڕازی دەبین لەسەر مەرج و خاڵە بنچینەییەکانی ئەم کارەی کە پێکەوە ئەنجامی دەدەین. بەڵام دەمەوێت کە هەردوولامان دڵخۆشبین، وە ئەگەر لەهەر کاتێکدا شتێك ڕویدا و بارودۆخی ڕێکەتنەکەی گۆڕی ئەوا با هەردوولامان پێکەوە دانیشین و دوبارە گفتوگۆبکەینەوە لەسەر مەرج و خاڵەکان وە بەم جۆرە هەردوولا بەردەوام بین لە دڵخۆشی".

وە باشترین شت ئەوەیە کە: من و هاوکارەکانم هەرگیز توشی دەمەقاڵێ و ناکۆکی نەبووین لە درێژای ئەم "بەڵێننامە چینی یانە". وە لەهەموو بارودۆخێکدا بەکراوەیی و هاوڕێیەتی ماوینەتەوە و جەختمان لەسەر قازانجەکانی هەردوولا کردۆتەوە لە کارکردنمان پێکەوە.

# بەشی چوارەم
# پەیوەندییە بازرگانییە هەمیشەییەکان

بـۆ هــەموو جـۆرە بازرگانییــەك تاڕادەیــەك وەك یەکــە. ســـەرەتا لەگـــەڵ کۆمپانیایـــەك یـــاخود تاکێـــك دەســـت بــەکارکردن دەکــەیت و لــە ئاســـتێکی ســـەرەتاییەوە، وە بــەپێی تێپــەڕبوونی کــات ئــەم پەیوەندییــە بازرگانییــە دەکرێت گەشە بکات و بگۆڕێت بـۆ بەشـێکی زۆر گـرنگ لـە ژیانی کەسی و لایەنی مادی ژیانت.

جـیرارد نـایرنبێرگ دەڵێـت:" کـە مەبەسـت و ئامـانج لـە گفتوگـــۆکردن بریتییـــە لــــەوەی کـــە هــــەموو لایەنـــە بەژداربووەکان بگەنە ڕێککـەوتنێك کـە تێیـدا قایـل بـن بـە هەموو خـاڵ و مەرجـەکان هـەر بـەم هۆیەشـەوە لەناخـەوە هاندراو بن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان و بتوانن گفتوگۆ و بازرگانییـــەکی ســـەرکەوتوو لەگـــەڵ لایـــەنی بەرامبـــەریان بەئەنجام بگەیەنن" .

بـا ئـەم پێناسـە ورد بکەیەنـەوە بـۆ بەشـەکانی. سـەرەتا، "بگەین بە ڕێککەوتنێك..." ئەمە واتای ئەوەیە کـە ئامـانج

لەگفتوگۆیـەکی بـەردەوام ئەوەنییـە کـە بیبەیـەوە یـاخود بدۆڕێی، تاوەکو ڕکابەرەکەت ببەزێنیت، بـەڵکو بـۆ ئەوەیـە کە بەجۆرێك لـە جۆرەکـان بگـەن بـە ڕێککـەوتنێك. کاتێـك هەردوولایەنەکـــە دەســـت دەکـــەن بـــە پڕۆســـەی گفتوگۆکردنەکە بەدڵسۆزیەکی تـەواوەوە تـاوەکو ڕێگایـەك بدۆزنـــەوە بۆئـــەوەی ڕێکبکـــەون، ئـــەوا هەڵســـوکەوت و ڕەوشتی هەردوولایەنەکە زۆرجیـاوازتر دەبێـت لـە شـێوازی سەرەتای گفتوگۆکردنەکـە وە هەمیشـە دەرەنجامـەکانیش باشتر دەبن.

دووەم بەشی پێناسەکە، "...هەموو لایەنە بـەژداربووەکان قایل بن بە مەرج و خاڵەکان...". دەبێـت ئـەوە بـزانین کـە هەرلایـــەنێك لـــە گفتوگۆکردنەکـــەدا مـــەرج و ویســـتەکانی جیاوازن لەلایەنەکەی دیکـە. هـەر لەبـەر ئەمەشـە کـە هـەر لەسەرەتاوە مشتومڕ و گفتوگـۆکردن دروسـت دەبێـت. بـۆ ڕێککـــەوتنێکی ســـەرکەوتوو و درێژخایـــەن، زۆر گـــرنگ و پێویستە کە هەردوولایەنەکە بـۆ ڕێگایـەك بگـەڕێن تـاوەکو دڵنیابن کە لایەنی بەرامبەر بەتـەواوی قـایلن بـە خواسـت و مەرجەکانی یەکتری.

**پێویستە هەردوولایەن دڵخۆش بن**

سێیەم بەشی پێناسەکە، "... بەجۆرێك کە هـەردوو لایـەن لەناخـــەوە هانـــدراوبن بـــۆ بـــەدیهێنانی ویســـت و ئامانجەکانیان..،"واتە کـە هـەردوو لایەنەکـە زۆر دڵخۆشـن بە دەرئەنجامەکانی گفتوگۆکردنەکـە وە ئەمـەش وادەکـات بیانەوێت ڕێککەوتنە بازرگانییەکە سـەرکەوتوو بێـت و ئـەو بەڵێنانە جێبەجێ بکـەن کـە لـە گفتوگۆکردنەکـەدا داویانـە بەیەك و بەم شێوەیەش بتوانن خۆشـی ببیـنن لـە سـوود و قازانجەکانی ڕێککەوتنەکە.

جارێکیـــان وتووێـــژێکم هـــەبوو لەگـــەڵ یـــەکێك لـــە جێبـــەجێکارەکانی دامەزراوەیـــەکی فێرکردنـــدا. زۆر بـــە شـانازییەوە پێـی وتم کـە ڕێککـەوتنێکی یـەکجار باشـی کـــردووە لەگـــەڵ یـــەکێك لـــە کۆمپانیاکـــانی چـــاپ و بڵاوکردنەوەدا. ئەوەندە ناچاری کردبـوون تـا لـە کۆتاییـدا ڕازی ببون پـارەی نوسـەر و بەرنامەداڕێـژەرەکانی خۆشـی بدات. بە ڕێکەوت بوو کە منیش یەکێك بووم لـە ئەنـدامانی ئەم بڵاوکراوەیە، وە زۆر سەرم سـوڕمابوو لـەوەی کـە ئـەم پیـاوە بـەڕێزە ئـەم ڕێککەوتنـە باشـەی کـردووە کـە مـن

هەرگیز تا ئێستا بە کارکردنم لەگەڵ ئەم دامەزراوەیەدا پێی نەگەیشووم لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا. کاتێک پەیوەندیم کرد بە سەرۆکی کۆمپانیاکەوە ئەوەی بۆ ڕوونکردمەوە کە لایەنەکەی تری گفتوگۆکردنەکە زۆر شەڕانگێز و خوازەلۆك بوون(داواکاری زۆریان هەبوو). هیچ خواست و ویستێکیان نەبوو بۆ چارەسەرکردن و بەئەنجامگەیاندنی. یان دەبوو بلاوکراوەکە ڕازیبێت بەوەی نرخێکی زیاتر بدات یاخود ئەم لایەنە هیچ جوڵەیەك ناکات، بەڵکو تەنها قسەی نەشیاو و ڕەخنەگرتن بوو لە نوسەر و بلاوکراوەکانی دیکە. سەرۆکی کۆمپانیاکە وتی " ئێمە کەسانی ناحەز و نەشیاومان ناوێت لە دەرەوەی ئێرە و لە بازاڕەکاندا، هەر لەبەرئەوە زۆر بەڕێزە و مەرج و خواستەکانی ئەوانمان پەسەندکرد. ئێستا مافی بلاوکردنەوە و بەرهەمهێنانی بەرهەمەکانیانم هەیە بەلام بە زۆرلێکردن و ناچاریکردن نا. وە نیازی ئەوەشمان نییە کە بلاویان بکەینەوە. بەرهەمەکانیان لەسەر ڕەفەکانمان دەمێننەوە تاوەکو کاتێك دێن و داوای دەکەنەوە. لێرەدا،

هەموو بەرهەمەکانیان پێدەدەینەوە و بەتەواوی کۆتایی بە هەموو پەیوەندییەکانمان دەهێنین لەگەڵیان.".

ئـەم جێبـەجێکارە وایـدەزانی کـە ئـەوەی ئەنجامیـداوە کارێکی زۆر باش بووە و بەرهەمەکانی بە نرخێکـی یـەکجار بەرز دەفرۆشێت لە بازاڕەکاندا. بەڵام بـەهۆی لەدەسـتدانی پەیوەندییەکی درێژخایەنی گرنگ، خۆی و کۆمپانیاکەیشی لە کۆتاییدا هیچییان بۆ نەمایەوە جگە لـە ڕێککـەوتنێك بـە نرخێکی کەم.

**یاسای هەوڵدانی ناڕاستەوخۆ**

لە گفتوگۆکردندا ڕێسایەك هەیە کە پێـی دەوترێـت یاسـای هــەوڵی ناڕاســتەوخۆ. یاســاکە دەڵێــت دەتوانیــت زیــاتر بەدەست بهێنیت کاتێك بەناڕاستەوخۆیی کار دەکەیت وەك لەوەی بەڕاستەوخۆیی کار بکەیت. بـۆ نمونـە، هـەتا زیـاتر هەوڵ بدەیت کە تەنها ئامانجەکانی خۆت بەدەست بهێنیـت لە گفتوگۆکردنێکدا، ئەوا کەمتر سەرکەوتوو دەبیت. کاتێك بەتەواوی کۆشش دەکەیت بۆ دەسکەوتنی ئـەو شـتەی کـە خۆت دەتەوێت، ئەوا کەسـانی دیکـە هەسـت بـە ناچـاری و زۆرەملێیــی دەکـەن و دەکشـێنەوە بۆئـەوەی بـەرگری لـە

خۆیـــان بکـــەن. بـــەلاَم هـــەتاوەکو زیـــاتر کاربکـــەیت و هەولّبـدەیت بـۆ دۆزینـەوەی رێگایـەك تـاوەکو لایەنەکـەی دیکەش پیێ ڕازی بێت( ڕێگـای ناڕاسـتەوخۆ)، ئـەوا لایـەنی بەرامبـەریش بـە هـەمان شـێوە کـار دەکـات بـۆ گەیشـتنە ڕێککەوتنێك کە تۆش پێی ڕازی بیت. ڕالّف والّدۆ ئیمرسۆن دەلّێت:"بۆئەوەی هاوڕێت هەبێت، ئـەوا پێویسـتە سـەرەتا خۆشت هاوڕێ بیت".

بـە بـەکارهێنانی یاسـای هـەولّی ناڕاسـتەوخۆ، کاتێـك کـە جەخت لەسەر ئەوە دەکەیتەوە بگەیتە ڕێککەوتنێك کە بـە دلّی لایـەنی بەرامبـەر بێـت و پێـی ئاسـودە بـن، ئـەوانیش ئـارام و لەسـەرخۆ دەبـن وە بـەدوای ڕێگەیەکـدا دەگـەڕێن تاوەکو ڕێککەوتنەکە بە جۆرێك بێـت کـە تـۆش پێـی قایـل بیت.

هەر لەبەر ئەمەیە من هەمیشە دەلّێم،" ئەمڕۆ بڕیار لەسـەر هەرچی بدەین، ئەمەوێت دلّخۆش بن. من ئامـادەم بـۆ هـەر بیرۆکە و پێشنیارێك کە هەتانە و واتان لێدەکات لە کۆتایی گفتوگۆکردنەکە و کۆتاییدا ڕێککەوتنەکەش خۆشـحالّ بـن. بەدلّنیاییەوە منیش دەمـەوێت دلّخۆشـبم، بـەلاَم وا هەسـت

دەکەم ئەگەر جەخت لەسەر دڵخۆشبوونی ئێوە بکەمەوە، ئەوا منیش دڵخۆش دەبم". ئەم ڕێگایە هەمیشە دەبێتە هۆی قایلبوونی هاوشانەکانم و دەگەینە ڕێککەوتنێك کە هەردوولامان پێی ڕازین و بەدڵخۆشییەوە کار دەکەین.

**بیر لە داهاتوو بکەرەوە**

بەشی چوارەم و کۆتایی لە پێناسەکەی نایرنبێرگ بریتییە لە، "... گەشتن بە مامەڵەیەکی باش لەگەڵ هەمان لایەن." ئەمە گرنگترین بەشی پەیوەندییەکی درێژخایەنە. واتای ئەوەی کە هەردوو لایەن دڵخۆشبن بەو ڕێگایەی کە ڕێککەوتنەکەیان پێکردووە و ئاواتەخوازن کە ڕێککەوتنەکە بەردەوام بێت.

ئەمڕۆ، باشترین بازرگانییەکان خۆیان دەکەن بە هاوڕێ و هاوبەش لەگەڵ، کڕیارەکان و فرۆشیارەکان و هێنەرەکانیاندا. لەبری ئەوەی بازرگانییەکەیان بلاوبکەنەوە بە ژمارەیەکی زۆر لە کۆمپانیاکاندا، تەنها لەگەڵ تاکە لایەنێك کاردەکەن بۆ پەرەدان بە پەیوەندییەکی ئاست بەرز کە ئەمەش ببێتە هۆی بەدەستهێنانی بەرهەمی باشتر، چوستی گەورەتر وە لە

کۆتایشـدا نرخـی نـزمتر و قـازانجی زیـاتر بـۆ هــەردوولا. ئــەوەش ڕێگایەکـە کـە لەلایــەن زۆرینــەی بازرگانەکانــەوە بەکاردەهێنرێت.

گفتوگۆی جۆری (II)پرۆسەیەکە نـە سـەرەتا، نـە ناوەنـد، نە کۆتایی نییە، لەبەرئـەوەی هەمیشـە بـەردەوام دەبێـت. خــاڵی دەســتپێك لــەم جـۆرە گفتوگۆکردنــە بریتییــە لــە بونیادنانی پەیوەندییەکی باش لەسـەر بنـەمای دڵسـۆزی و باوەڕ بە یـەکترکردن. باشـترین پەیوەندییـە بازرگانییـەکان کە هەبێت هەر لە کڕین، فرۆشتن، دامەزراندن، یـاخود هـەر شـتێکی دیکـە، ئـەو پەیوەندییەیـە کـە لەسـەر بنەمایـەك دانراوە کە هەموان تیایدا دڵخۆشبن و لە هەموو بارووددۆخـە جیاوازەکانیشدا هەر بـەردەوام بێـت. وە خـراپترین جـۆری گفتوگۆکردنیش ئەو جۆرەیە کە لە کاتی کۆتاییهاتنیدا هیچ لایەنێك دڵخۆش و ڕازی نەبن. هیچ لایەنێك نەیەوێت لەگـەڵ لایەنەکەی دیکە گفتوگۆ بکاتەوە جارێکی تر. وە هـەردوولا زۆر بێزار و ناڕەحەت بن سەبارەت بە مەرج و خواستەکانی ڕێککەوتنەکە.

# بەشی پێنجەم
# شەش شێوازی گفتوگۆکردن

ڕێگە و شێوازی یەکجار زۆر هەن بۆ گفتوگۆکردن، بەلاّم دەبێت بەتەواوی ڕوون و کراوە بیت سەبارەت بەو جۆرە گفتوگۆیەی بەکاری دەهێنیت بۆ دەستکەوتنی ئەو دەرئەنجامەی کە دەتەوێت و هەوڵی بۆ دەدەیت.

گفتوگۆی بردنەوە – دۆڕان

یەکەم جۆر پێی دەوترێت " گفتوگۆی بردنەوە و دۆڕان " ئەمە لە کاتێکدایە لایەنی (أ) هەموو ئەوانە بەدەست دەهێنێت کە دەیەوێت وە لایەنی (ب) دەدۆڕێت. ئەمە ئامانجی گفتوگۆی جۆری (I)ـە وەك لە بەشی سێهەمدا باسمانکرد. ئەمە ڕێگایەکە بۆ تەنها یەك مامەڵە بەکاردەهێنرێت، لەکاتێکدایە کە تۆ دەتەوێت کە زۆرترین فرۆشتنت هەبێت بە بەرزترین نرخ وە یاخود کڕین بە نزمرین نرخ. ئەم جۆرە مامەڵەکردنە بۆ ئەوە نییە کە هاوڕێ و پەیوەندیی درێژخایەن دروست بکەیت. بەڵکو

تـەنها بۆئەوەیـە کـە باشـترین مامەڵـە بەدەسـت بهێنیـت. گرنگی بەوە نادەیت کە ئـاخۆ کەسـی بەرامبـەر دڵخـۆش و ڕازی بێت بە نرخ و مەرجەکانت. ئامانجت تەنها بردنەوەیە. بەدڵنیاییەوە، ئەمە جۆرێك نییـە لـە گفتوگـۆكردن کـە مـل بـدات بـۆ مامەڵـە و بازرگـانی زیـادە، مەگـەر لـە دۆخێکـی تایبەتــدا، وەك ئــەوەی کاتێــك موڵکەکــەت لــە ڕەهنــدا دادەنێیت تاوەکو بەخێرایی و بە مۆڵی پارەکە وەربگریـت. لـەم دۆخـەدا کەسـی ڕەهنکـەر براوەیـە، نرخـی بەشـێکی دەدات، وە ئـەو کەسـەش کـە موڵکەکـەی ڕەهـن کـردووە دۆڕاوە، چونکە تەنها بەشێك وەردەگرێت.

گفتوگۆی دۆڕان – بردنەوە

دووەم جۆری گفتوگۆكردن"گفتوگۆی دۆڕان و بردنەوە"یـە کە ئەمەش پێچەوانەی یەکەم جۆری گفتوگۆکە "گفتوگـۆی بردنەوە و دۆڕان" بوو. لەم جۆرە گفتوگۆیـەدا لایـەنی (ب) هەموو ئەوانـەی دەیـەوێت دەسـتی دەکـەوێت و لایـەنی (أ) دەدۆڕێـت. ویسـت و مەرجـەکانی لایـەنی (ب) بەدەسـتدێت بـەڵام ویسـتەکانی لایـەنی (أ) بـەدی نایـەن. ئـەم جـۆرەی گفتوگۆکردن کاتێك بەکاردێت کە لایەنێك وەك ڕکابـەر و دژ

لایەنەکەی دیکە ببینێت وە بیەوێت باشتر بێت لەو بە هەرجۆرێك بێت.

## گفتوگۆی دۆڕانی هەردوولا

سێیەم جۆر "گفوگۆی دۆڕانی هەردوولا"یە. لەم بارووددۆخەدا هەردوو لایەنی بەشداربوو دەگەنە ڕێککەوتنێك کە هیچ لایەنێکیان قایل نین پێی، لەبەرئەوەی هیچ کام لەم دوو لایەنە ئەوەی دەیانەوێت بەدەستیان نەهێناوە. وە ئەم جۆرە گفتوگۆیە هەمیشە لە شێوەی دەمەقاڵێ و ڕق و دوژمنکارانەدایە.

بۆ نمونە، پیاوەکە دەگەڕێتەوە ماڵەوە و بە ژنەکەی دەڵێت "با بۆ نانی ئێوارە بچینە دەرەوە، حەزدەکەیت بۆکوێ بچین؟"، ژنەکە وەڵام دەداتەوە و دەڵێت "حەزدەکەم بچین خواردنی دەریایی بخۆین"، بەڵام پیاوەکە دەڵێت کە حەزی بەو خواردنە نییە بەڵکو واباشترە بچن خواردنی ئیتاڵی بخۆن. بەڵام ژنەکە دەڵێت کە تازە ئەو خواردنەمان خواردووە و حەزیشم لێی نییە. لەسەر ئەوە ڕێکدەکەون کە بچنە دەرەوە و خواردنی

چینی بخۆن، کە ئەوەش هیچ لایەنێکیان نایانەوێت بەڵام لەم حاڵەتەدا باشترین چارەسەرە.

ئەمە گفتوگۆی دۆڕانی هەردوولایە. نە ژنەکە ئەوەی بەدەستهێنا کە دەیویست نە پیاوەکەش. بەڵام دەرئەنجامەکەیان پەسەندکرد لەبەرئەوەی هەر هیچ نەبێت شتێکیان لێ دەستکەوت وەك ئەوە نییە کە هیچیان دەست نەکەوتبێت.

## گفتووگۆی چارەسەری ناوەندی

چوارەم جۆری گفتوگۆ پێی دەوترێت چارەسەری ناوەندی. لەم جۆرە گفتوگۆیەدا، هەردوولایەن شتێکیان دەست دەکەوێت کە هەرچۆنێك بێ باشە بەڵام هەموو ویستەکانی لایەنەکان جێبەجێ ناکات. لەکۆتایی گفتوگۆکەدا هەردوولا بە کەمێك ناخۆشییەوە دەڕۆن. ئەوەندەش دڵتەنگ نین کە پەشیمان بن لە چونە ناو ڕێککەوتنەکە، بەڵام زۆر دڵخۆش و بەپەرۆشیش نین بە دەرئەنجامەکان.

**گفتوگۆی نەگونجاندن**

پێنجەم جۆر پێی دەوترێت "گفتوگۆی ڕێکنەکەوتن یاخود پێکنەهاتن". لەم دۆخەدا هەردوولایان ویست و خواست و مەرجەکانیان دەخەنەڕوو بۆ یەکتری، بەڵام لە کۆتایدا بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە ناتوانن بگەن بە ڕێککەوتنێك. لەبەرئەوەی ویستەکانیان زۆر دوورن لە یەکترییەوە. بۆیە ڕازین بەوەی کە ڕێککەوتنەکە پەسەند نەکەن وە هەریەکەیان بەڕێگای خۆیاندا دەڕۆن، بەبێ ئەوەی هیچ دڵتەنگی و ناخۆشییەك ڕووبدات. وە دەرگای گفتوگۆکردن واڵا دەبێت لەنێوانیاندا بۆ جارێکی دیکە ئەگەر بیانەوێت بە مەرج و خاڵی جیاوازەوە ڕێککەوتن بکەنەوە.

بۆ نمونە، دەتەوێت شتێك بکڕیت، بەڵام نرخی داواکراو زۆر زۆرە تۆ نرخێکی کەمتر دەدەیت بەڵام لایەنی بەرامبەر ڕازی نابێت بەم نرخە. نە تۆ نرخی زیاتر دەدەیت نە ئەویش کەمتری دەکاتەوە. بەم شێوەیە ڕێککەوتن ڕوونادات لەنێوانیاندا.

**گفتوگۆی بردنەوەی هەردوولایەن**

لـە کۆتایـدا باشـترین جـۆری ڕێککـەوتن هەیـە کـە ئـەویش "گفتوگـۆی بردنـەوەی هەردوولایـەن"ـــە، ئەمـە ئامـانجی تۆیـە، لـەم جـۆرە گفتوگۆیـەدا هەردولایـەن هەسـت بـە بردنـەوە و سـەرکەوتن دەکـەن. هەردوولایـەن وا هەسـت دەکەن کە باشترین ڕێککەوتنیان ئەنجامداوە. هەردوولایەن دڵخـۆش و قـایلن، وە پەرۆشـن بـۆ بـەدیهێنانی ڕاسپاردەکانیان و چونە ناو ڕێککەوتنێکی دیکـەوە لەسـەر هەمان بنچینە و مەرج.

لە زۆرینەی دۆخەکاندا، ئەم جۆرە گفتوگۆیە پێویسـتی بـە جێگرەوەی سـێهەم هەیـە، کـە باشـترە لـە هـەموو بیرۆکـە سەرەتاییەکان. هەردوولایەن بە چەندین بیرۆکە و خواسـت و مـەرجی جـێگیرەوە دێنـە نـاو ڕێککەوتنەکـەوە. وە هەمیشە وا هەست دەکەن شتەکان مەحاڵ بێت کـە بتـوانن چارەسـەرێك بـۆ مـەرج و خواسـتە جیاوازەکـان بدۆزنـەوە.

بەڵام لە پاشاندا جێگرەوەی سێهەم دێننە پێشەوە، کە لە زۆربەی دۆخەکاندا جیـاوازە لـەوەی هەریـەك لـە لایەنـەکان

بیریان لێ کردبوویەوە بەرلەوەی بێنە گفتوگۆکردنەکەوە بۆ یەکەمجار.

بەدوای چارەسەرێکدا بگەڕێ بۆ بردنەوەی هەردوولا

ماوەیەك بەرلە ئێستا، لە گفتوگۆکردنێکدا بووم لەگەڵ ئەنجومەنی شارۆچکەکە لە ڕێککەوتننامەیەکی خانوبەرەدا بۆ ٣٣٠ ماڵ. کڕیارەکانم هەستان بە کڕینی ئەم موڵکانەی کە لەسەر ڕێگای شارۆچکەکە بوون و هەموو کار و نەخشەکێشانەکانی زەوییەکانیان بەئەنجامگەیاند. هەرچۆنێك بێت، خەڵکی شارۆچکەکە داوای ١٠٠٠٠ دۆلاریان دەکرد بۆ هەر موڵکێك، بەکۆی ٣،٣ملیۆن دۆلارەوە بە شێوەی مۆڵ دەیانویست. ئەمە بڕێکی یەکجار زۆر نەبوو، لەبەرئەوەی شارۆچکەکە پێویست بوو کە بڕێکی زۆر پارە خەرج بکات تاوەکو ئەو بەشە نوێیانە بکاتەوە. بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو کە کڕیارەکانم لەو کاتەدا پارەی مۆڵیان پێنەبوو هەتاوەکو دەستبەجێ پارەکە بدەنە خاوەن موڵکەکان.

هەر لەکاتەی کە وامان هەستکرد کە گەشتوینەتە ڕێگایەکی داخراو وە کڕیارەکانم وایان بیرلێکردەوە کە

ڕێککەوتنەکەیان لەدەست دەردەچێت، لەم کاتەدا من پێشنیاری چارەسەری بردنەوەی دوولایەنم بۆ کردن"وا دیاربوو کە ئەمە کۆتا خاڵ بێت کە ئەنجامی بدەین لەگەڵ ئەو ٣،٣ملیۆن دۆلارەدا"، وتم " ئەمە پێشنیاری منە و بە چارەسەری دەزانم.ئێمە ڕازی دەبین کە ئەو پارەیەی داواتان کردووە پێتان بدەین". پاشان وتم "وە بە هەموو ئەو شتانەش ڕازی دەبین کە لە ماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا قسەمان لەسەری کردووە، بە پێدانی ئەو ٣،٣ملیۆن دۆلارەوە بە شارۆچکەکە، بەڵام تەنها داوای ئەوەتان لێدەکەم کە مافێکی کەمیش بە ئێمە بدەن، بەوەی کە ڕازیبن ئەو ٣،٣ملیۆن دۆلارە وەربگرن بۆ هەر بەشێك بەڵام لەپاش ئەوەی کە ئێمە موڵکەکانمان فرۆشت بە دروستکەری خانووەکان". هەموان لە ژوورەکە بێدەنگ بوون، لە کۆتایدا،سەرۆکی شارەوانی بێدەنگییەکەی شکاند."باشە، بە دڵنیاییەوە ئێمە حەز دەکەین کە هەموو بڕ پارەکە بە حازری وەربگرین، بەڵام ئەگەر فرۆشتنی موڵکەکان بە باشترین شێوە بێت و بتوانن بەش بەش

پارەکە بدەن لەگەڵ هەر فرۆشتنێکدا، ئەوا ئێمەش ڕازی دەبین و مامەڵە دەکەین".

ڕێککەوتنەکە بەئەنجام گەیشت، هۆکاری گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە ئەوە بوو کە ئەم جۆرە شتانە ڕوودەدەن بەبەردەوامی لە کاتێکدا کە پێویستت بە چارەسەرکردنی بردنەوەی دوولایەنی هەیە. هەمیشە ئامادەبە تاوەکو بیر لە کارەکان بکەیتەوە، کاتێك وا هەست دەکەیت ڕێگاکەت داخراوە. تەواو ڕوون و ئاشکرابە سەبارەت بەوەی کە هەر لایەنێك چی دەوێت، لە پاشان تەماشا بکە ئایا دەتوانیت ڕێگایەك بدۆزیتەوە بۆ بەدەستهێنانی ئەو خاڵە هاوبەشانەی کە هەموان دەیانەوێت وە وادەکات هەردوولا وا هەست بکەن کە براوەن.

# بەشی شەشەم
# بەکارهێنانەکانی هێز لە گفتوگۆکردندا

تۆ هەمیشە هێز و توانای زیاترت هەیە لە گفتوگۆکردندا زیاتر لەوەی کە بیری لێ دەکەیتەوە. تەنانەت کاتێک وا بیر دەکەیتەوە کە کەسی بەرامبەر هەموو هێز و توانایەکی هەیە، ڕەنگە ئەوە بێت کە تۆ شتێکت هەیە کە ئەو دەیەوێت، یاخود شتێکە ئەو دەیەوێت کە هاوسەنگیی هێز و توانای تۆ تێکدەدات و ناجێگیری دەکات و لە سوودی تۆ نابێت. چەندین ڕێگا و شێواز هەن کە دەتوانین هێز و تواناتی پێ زیاد بکەیت لە گفتوگۆکردندا، لە ڕێگەی خۆ ئامادەکردن، دەسەڵاتداریی، زانیاریی تەواو لەسەر لایەنی بەرامبەر، هاوسۆزی، خەڵاتکردن یاخود سزادان و وەبەرهێنان.

هێز و توانای ئامادەکاری (خۆئامادەکردن)

هەتا زیاتر ئامادەکاری بکەیت زانیاری زیاترت هەبێت ئەوا زیاتر بەهێز دەبیت کاتێک کە دەچیتە گفتوگۆکردنێکەوە.

ئەرکەکانت ئـەنجام بدە. ڕۆبێـرت ڕیگنـەر، گفتوگۆکـارێکی لێهـاتووە، بـاس لــە بردنــی ژمێریارێــك، پارێزەرێــك وە بەڕێوەبـەرێکی بازرگـانی دەکـات بـۆ گفتوگـۆکردن لەگـەڵ تـەنها خـاوەن موڵکێـك. ئەمـە دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی هێزی تێـڕوانین و تێبـینی کردنـی یـەکجار زۆری چوسـتی و فێربوونی مامەڵەکردن لەکاتی گفتوگۆکردندا.

**هێزی دەسەڵاتداری**

دەبێـت ئـەوە بەتـەواوی ڕوون بکەیتـەوە کـە دەسـەڵاتی تەواوت هەیە بۆ کڕین یاخود نەکڕین– بڕیـاردان لـە کـڕینی شـتێك یـاخود نـەکڕینی هێـزت پێـدەدات. هـەروەها کاتێـك ئەوەت لەلا ڕوونە کە تەواو زانیارییت هەیە لەو بوارەدا، وە ئەوەی کە بەتەواوی نرخەکان و مەرج و ویسـتەکان دەبێـت چـۆن بـن، ئەمـە هەمیشـە وادەکـات کـە لایـەنی بەرامبـەر کەمێك بترسێت وە بیەوێت ڕێککەوتنێکی باشـترت لەگـەڵ بکات. واتە لێرەدا هێزی تۆ زیاتر دەبێت و لایەنی بەرامبەر هەوڵدەدات ڕێککەوتن ئەنجام بدات.

هێزی زانینی خواست و پێویستییەکانی لایەنی بەرامبەر

هەتا زیاتر بزانیت لەسەر باروودۆخی لایەنی بەرامبەر، ئـەوا هێز و توانایەکی زیاترت دەبێت لـە گفتوگۆکردنـدا. ئەگـەر بـۆت دەرکـەوت کـە لایـەنی بەرامبـەر زۆر پێویسـتی بـەو بەرهەم و خزمەتگوزارییە هەیە کە تۆ پێشکەشی دەکەیت، یـاخود ئـەوەی کـە کۆمپانیاکـەی دیکـە کـە کێشـەیەکی ماددی هەیە و پێویستی بە دڵنیایی و سەرمایە هەیە، ئـەوا لێـــرەدا تـــۆ هێزێکـــی زۆر زیـــاترت دەبێـــت تـــاوەکو ڕێککـەوتنێکی زۆر بـاش لـە بەرژەوەنـدی خـۆت ئـەنجام بدەیت.

**هێزی هاوخەمیکردن یاخود ناسینی کەسی**

ئـــەم هێـــزە لەلایـــەن گفتوگۆکـــارە ئاســـت بەرزەکانـــەوە بەکاردەهێنرێت لە هەموو بوارێکدا. هەتا زیاتر کات بەسـەر بـەریت لـە پەیوەندییـەکانت لەگـەڵ لایـەنی بەرامبـەردا و ناسین و تێکەڵاوبوون لەگـەڵی، ئـەوا بەرامبەرەکـەت زیـاتر دڵخۆش و ئاسوودە دەبێت وە حەز بە گفتوگۆکردن دەکات لەگەڵت بۆ ویست مەرجی باشتر.

**هێزی خەڵاتکردن و سزادان**

ئەمە هێزێکی سەرەکی و پێویستە کە بتوانیت پـەرەی پـێ بـدەیت لـە گفتوگۆکردنـدا. کاتێـك لـە توانـات دابـوو کـە خـەڵاتێك یـاخود قازانجێـك بگەیـەنیت بـە کەسێك، یـاخود پێنەدان و ڕێگرتن لـە قـازانج و خـەڵاتکردنی، ئـەوا لایـەنی بەرامبەر زیاتر پێـی خـۆش دەبێـت کـە بازرگانییـت لەگـەڵ بکات، وە دەیانەوێت گفتوگۆت لەگەڵ بکەن.

**هێز و توانای وەبەرهێنان**

ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بـڕە کـات و هەوڵدانـەی کـە تـۆ و کەسـی بەرامبـەرت بەسـەری دەبـەن لـەم گفتوگۆکردنـەدا. ئەگـــەر تـــەنها پێـــنج خولـــەك بەســـەربەریت کەواتـــە وەبەرهەمهێنان لە بەشی تۆ زۆر کەم دەبێت. بـەڵام ئەگـەر پێـنج ڕۆژ، پێـنج هەفتـە یـاخود پێـنج مـانگ بەسـەربەریت بەکارکردن بۆ ڕێککـەوتنێك، ئـەوا وەبـەرهێنانێکی گـەورەو بەرچـاو دەکـەیت، کـە کاریگەرییـەکی زۆر لەسـەر لایـەنی بەرامبــەر دروســت دەکـات. هــەتا وەبــەرهێنان لەلایــەنی بەرامبــەر و لایــەنی تــۆ زیـاتر بێـت ئـەوا هێزێکـی زیـاترت دەبێت لە گفتوگۆکردنەکەدا.

# بەشی حەوتەم
# هێزی پێزانین و تێبینی کردن

هێز واتە پێزانین و تێبینی کردن. ئەو هێزە نییە کە هەتـە، بـەڵکو ئـەو هێزەیـە کـە لایـەنی بەرامبـەر هەسـت دەکـات هەتە. هاوڕێیەکی نزیکم، کـە خـاوەنی ملیۆنـان دۆلار بـوو، جارێکیان توشـی زەرەرێکـی زۆر و قـەیرانێکی دارایـی زۆر هـات. بۆیـە ناچـار بـوو کـە زۆرێـك لـە موڵـك وماڵـەکانی بفرۆشـێت و خەرجییـەکانی کـەم بکاتـەوە، وەك فرۆشـتنی یـەخت و خـانووە گرانبـەهاکانی. بـەڵام ئەمـەی بـە هـیچ کەسێك نەگوت. لە ئەمرۆدا، خەریکە دەگەڕێتەوە بـۆ سـەر ڕێگاکەی خۆی خەریکی کڕین و فرۆشـتن و گفتوگـۆکردن و بازرگانیکردنــە کۆمپانیایــەك دەکڕێــت و یــەکێکی دیکــە دەفرۆشـێت. لەبەرئـەوەی هـەموان وا هەسـت دەکـەن کـە هێشتا دەوڵەمەندە، ئەمیش خۆی وا دادەنێت کـە خـاوەنی هـەمان ئـەو سـەرمایەیە کـە چـەند سـاڵێك بەرلـە ئێسـتا هـەیبووە، بۆیـە هێـزی پێـزانین و تێبـینی کـردن هـەموو

شتێکە. گرنگی هێزی تێگەشتن و تێبینی کردن بەسەر جۆرەکانی هێز و توانادا حێبەجێ دەکرێ لە گفتوگۆکردندا کە لەبەشی پێشوتردا باسمان کرد. لێرەشدا چەند ڕێگایەکمان هەیە کە هێز و توانای پێدەردەخەین و کاریگەری دەبێت لەسەر گفتوگۆکردنەکەمان.

**هێزی دەگمەنی**

زۆرینەی کات خەڵکی نازانن کە چەند دەیانەوێت خزمەتگوزارییەك یاخود بەرهەمێکیان دەست بکەوێت هەتاوەکو لەدوایدا بۆیان دەردەکەوێت کە ناتوانن بەدەستی بهێنن. زانین و درککردن بەوەی کە تۆ شتێکی دەگمەنت هەیە و کەسی بەرامبەر پێویستی پێیەتی وە ئەوەی کە ئامادەن دەستبەجێ لێی بکڕن، هێز و توانایەکی یەکجار زۆرت پێدەدات لە گفتوگۆکردنەکەدا.

**هێزی گوێپێنەدان و بێ دەربەستی**

ئەمە کاتێك بەشێوەیەکی گوێ پێنەدەر و بێ هەست خۆت دەردەخەیت لە ماوەی گفتوگۆکردنەکاندا، وە دروستکردنی دۆخێك کە وای نیشانبدەیت گرنگ نییە بەلاتەوە کە ئەگەر ئەو بابەتە بکڕیت یاخود بیفرۆشیت.

ئـــەم شـــێوازە پێـــی دەوترێـــت ڕوخســـاری بـــێ هەســـت و ساردوسڕ.

کاتێك سەیری پاڵـەوانانی پۆکـەر دەکـەیت لـە تەلـەفزیۆن، ئەوە بەدی دەکەیت کە دەموچاویان بەهێمنی، دەهێڵنـەوە و تاڕادەیـەك بێـزار دەردەکـەون لەمیانـەی یارییەکـەدا. وە ئەوە باشـتر دەبێـت ئەگـەر لایـەنی بەرامبـەر بـەجۆرێك لـە جۆرەکان پەرۆش بێت بۆئەوەی ڕێککـەوتن ئـەنجام بـدات. وە ئەگەر هاتوو تۆ بەشێوەیەك خۆت دەربخەیت کە زاڵیـت بەســـەر دۆخەکـــەدا و لایـــەنی بەرامبـــەر وانـــەبێت، ئـــەوا ڕێککەوتنێکی باشتر ئەنجام دەدەیت.

**هێزی ئازایەتی و بوێری**

کاتێـك بـوێری و ئازایـەتی نیشـاندەدەیت لـە ویسـتەکانتدا بۆئەوەی پێگەی خۆت بەهێز بکەیت لـە ڕێکەوتنەکـەدا، وە بـۆ پێشکەشـکردنی داخوازییـەکانت بەشـێوەیەکی ڕوون و ڕاســـــت و ڕەوان، بـــــۆ مەترســـــییەکانی شکســـــت لـــــە گفتوگۆکردندا، وە بۆ دورکەوتنەوە لە ڕێککـەوتنێك ئەگـەر پێویست نەبێت. کاتێك لایەنی بەرامبەر ئەوە دەبینێـت کـە بەتـــەواوی بـــاوەڕت بـــەوە هەیـــە کـــە ئـــەنجامی دەدەیـــت و

پێشکەشــی دەکــەیت، ئەمــە وایــان لێــدەکات کــە نرخــی باشترت پێبدەن.

**هێزی ڕاسپاردن و خستنەئەستۆ**

کاتێك لایەنی بەرامبەر وا دەتبینێت کە بەتــەواوی بتــەوێت ڕێککەوتنەکە بەئەنجام بگەیەنیت، هــەموو کارێــك دەکــەیت کــە پێویســتت بێــت بــۆ بەدەســهێنانی ڕێکەوتنەکــە، ئــەوا لێرەدا هێزێکی تایبەتت دەبێت.

لــەماوەی جــەنگی دووەمــی جیهانیــدا، ســوپای بــەریتانیا ٨٠,٠٠٠ هێزی سەربازی هەبوو لە ســەنگافورەوە ئامــادەکرا بــوون بــۆ جــەنگێکی داگیرکــاری. بــەڵام یابــان بــە هێزێکــی کەمترەوە توانی سەنگافورە لەبەریتانییەکان داگــیر بکــات. بەریتانییەکانیان ترساند بەوە کە ئەوان ئەوەنــدە پابەنــدن بـــە ســـەرکەوتنەوە کـــە تەنانـــەت دەســـتدەگرن بەســـەر دورگەکەدا و هەموو ئەوانە دەکوژن کە لێــی دەژیــن هــەموو دانیشتوانەکەشی. لەبەرئــەوەی یابانییــەکان لــە پێشــتریش مالیزیایان داگیرکردبوو، وە کوشــتارییەکی یــەکجار زۆریــان کردبوو، بەریتانییەکان دڵنیابوون لەوەی کە ئەوان دەتوانن ســـەنگافورە داگـــیر بکـــەن. ئـــەم پێشـــبینی کـــردن و

نەخشـــەدانانەی یابانییـــەکان وایکـــرد کـــە بەریتانییـــەکان خۆیان بەدەستەوە بدەن.

**هێزی زانین و شارەزایی**

ئەو لایەنەی کە زانیـاریی و شـارەزایی زیـاتری هەیـە ئـەوا هێزێکــی زۆر زیاتریشــی هەیــە لــە گفتوگۆکــەدا. کاتێــك بەرهەمێك یاخود خزمەتگوزارییـەکی ئـاڵۆز دەفرۆشـیت وە زانیارییـەکی تـەواوت هەیـە سـەبارەت بـە بابەتـەکان ئەمـە سودێکی زۆری بـۆت دەبێـت لەبەرامبـەر ئـەو کڕیـارەدا کـە زانیارییـــەکی کـــەمتری هەیـــە ســـەبارەت بـــەو بەرهـــەم و خزمەتگوزارییە.

سەرکەوتوترین بازرگانییە تاکفرۆشەکانی جیهان بریتین لـە کۆگای ئەپڵ. تێکڕای فرۆشتنی وایـڵ ئیفـانی و کۆمپانیـای نیۆرك لەهەر چوارگۆشەیەکدا (٢٠٠٠) دۆلارە، بەڵام تێکـڕای فرۆشــی ئــەپڵ (٤٦٠٠) دۆلارە. بۆچــی؟ لەبەرئــەوەی ئــەو کەسانەی کار بۆ کۆمپانیای ئەپڵ دەکەن زانیاری تـەواویان هەیــە ســەبارەت بــەو بەرهــەم و خزمەتگوزارییانــەی کــە دەیفرۆشــن، ئەمــەش وا لــە خــەڵکی دەکـات کـە سـەدان و هەزاران دۆلار بدەن بۆ کڕینی.

# بەشی هەشتەم
# کاریگەریی هەست و سۆز لەسەر گفتوگۆکردن

هەست و سۆز کلیلی سەرەکییە لە گفتوگۆکردندا. هەستەکان، بەتایبەتیش هەستەکانی ویستن، چاوبرسێتی، ترس و تووڕەیی، دەکرێت یارمەتیدەربن یاخود زەرەرمەندت بکەن لە گفتوگۆکردندا. هەتاوەکو زیاتر دەست بەسەر هەست و سۆزەکانتدا بگریت لە گفتوگۆکردندا ئەوا هەلی بەدەستهێنانی ڕێککەوتنی باشتر دەبێت هەم بۆخۆت وە هەم بۆ دامەزراوەکەشت. وە هەتاوەکو هەست و سۆزت بەسەرتا زاڵ بێت ئەوا لاوازتر دەردەکەویت وە گفتوگۆیەکە لە بەرژەوەندی تۆدا نابێت.

هەست و سۆزەکان بەهاکان دەشێوێنن. کاتێک هەستەکانت بەسەرتدا زاڵ دەبن ئەوا ناتوانیت بەباشی بیر بکەیتەوە و بڕیاری دروست بدەیت. هەرشتێک ئەنجام بدەیت بۆئەوەی بەهێمنی و ئارامی بمێنیتەوە لەمیانەی

گفوگۆکردنەکەتــدا یارمەتیــدەرت دەبێــت بــۆ بەدەســت کەوتنی ڕێککەوتنێکی باشتر.

چەندە بەپەرۆشی بۆ بەدەستهێنانی شتێك؟

بەهێزترین هەست لە گفتوگۆکردندا بریتی یە لە "خواست و ویســت" هــەتاوەکو زیــاتر بتــەوێت کــە بەرهــەمێك یــا خزمەتگوزارییەکی دیاریکراو بکڕیت یاخود بەدەستیبهێنیت وە یــاخود بتــەوێت شــتێك بفرۆشــیت، ئــەوا هێــزت کــەمتر دەبێت لە گفتوگۆدا.

کاتێــك زۆر پێــداگری دەکــەیت لــە بەدەســتهێنانی شــتێك ئامادەیت هەر نرخێك بدەیت بۆی. ئەگەر لایــەنی بەرامبــەر بزانێت کــە چــەندە شــتێکت دەوێــت، ئــەوا هەســت دەکــات زیــاتر براوەیــە. هێــزی گــوێ پێنــەدان و بــێ دەربەســیت لــەبیربێت کــە لــە بەشــی پێشــوتردا باســمانکرد. هەنــدێك پرسیار لە خۆت بکــە. چــی ڕودەدات ئەگــەر ئــەو بەرهەمــە بەدەست نەهێنی؟ خراپترین شت چییە کــە ڕوبــدات ئەگــەر نەتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنیت لــەم گفتوگۆکردنــەدا؟ ئایا ئەگەر بەدەستی نەهێنیت ئەمە دەتکوژێــت؟ خــۆت بــۆ ئەوە ئامادە بکە کە ڕەنگە شــتەکان بــە ویســتی تــۆ نــەبن.

هەتا زیاتر ئارام و لەسەرخۆ بیت سەبارەت بە بیرۆکەکانی سەرنەکەوتن لە گفتوگۆکردندا چ کڕین چ فرۆشتن بێت، ئەوا توانای بیرکردنەوەت زیاتر دەبێت و بڕیاری باشتر دەدەیت.

**جڵەوگیری هەست و سۆزەکانت بکە**

چاوچنۆکی یەکێکی ترە لە هەستە جڵەونەگیراوەکان و کاریگەرییەکی یەکجار زۆری هەیە لەسەر بیرکردنەوەکانت. بیرۆکەی بەدەست هێنانی شتەکان بەبێ پارە وە یاخود بەنرخێکی زۆر کەمتر لە نرخی خۆی دەکرێت ببێتە هۆی شێوانی هەستەکانت و زۆر قورس بێت بۆت کە بەڕوونی بیربکەیتەوە. بیرۆکەی بەدەستهێنانی شتێك کە شایستەت نییە، یاخود شتێك وەك ڕێککەوتنێکی مەترسیدارە، دەکرێت زیان بە توانای بڕیاردانی دروستت بگەیەنێت.

لەگەڵ هەستەکانی ویستن و چاوچنۆکیدا، ترس مەترسیدارترین هەستەکانە. هەتاوەکو زیاتر بترسیت لە دەرئەنجامەکان ئەوا زیاتر توشی ئەو بارودۆخ و شتانە دەبیت کە حەزت پێیان نییە. هەر لەبەر ئەمەیە کە گوێپێنەدان و خۆڕاگری لە دۆخەکاندا و گرنگی نەدان

بەوەی کە بابەتێك دەرئەنجامێکی دیاریکراو بەدەست بهێنێت لە گفتوگۆکردندا، باشترین ڕێگایە تاوەکو هەستەکانت بەهێمنی بهێڵیتەوە. لە کۆتاییدا یەکێکی دیکە لەو هەستانەی کە دەبنە هۆی بڕیاردانێکی لاواز و نادروست لە گفتوگۆکردندا تووڕەییە. ترس و تووڕەیی زۆرینەی کات لەلایەن گفتوگۆکەرە کارتێکەرەکانەوە بەکاردەهێنرێت تاوەکو کاریگەری لەسەر خەڵکی دروست بکەن و وایان لێبکەن بڕیارێکی نادروست بدەن کە هیچ باش نییە بۆیان.

**لە هەموو کاتێکدا بەهێمنی بمێنەرەوە**

هەر کاتێك لە گفتوگۆکردندا هەستت کرد کە هەستیار دەبیت، ئەوا داوای ماوەیەکی کەم بکە تاوەکو پشوویەك وەربگریت. بڕۆ دەرەوە پیاسەیەك بکە. دوای نان خواردن یاخود ڕۆژێکی دیکە بگەڕێرەوە. هەوڵبدە هەرگیز بڕیارێکی گرنگ نەدەیت یاخود هیچ مەرجێك پەسەند نەکەیت لە کاتێدا بارودۆخت جێگیر نیە و جۆرە هەستێك زاڵە بەسەرتا.

لـەخۆت بپرسـە "چـی تێدایـە؟" ئەگـەر ڕێککەوتنەکـە سـەرنەگرێت، چـی تێدایـە؟ چـی دەبێـت؟ یـەکێك لـە ئامۆژگاریکـەرەکانم، کـە بازرگـانێکی زۆر سـەرکەوتووە، جارێکیان شتێکی پێ وتم کە هەرگیز لەبیرم ناچێت. کاتێك زۆر بەپەرۆش بووم سەبارەت بـە ڕێککـەوتنێکی بازرگـانی، پێی وتم " برەین، ڕێککەوتنەکان وەك پاس وان. هەمیشـە کـە دانەیـەك دەڕوات دانەیـەکی تـر دێت. زۆر بەپـەرۆش و دوودڵ مەبـە سـەبارەت بـەم ڕێککەوتنـە. ئەگـەر ئەمـەش ڕێکنەکەوت ئەوا لـەبیری بکـە. دانەیـەکی دیکـەت بـۆ دێتـە پێش" وە جارێکیان پیاوێکی دانا پێی وتم " هەنـدێك جـار باشترین ڕێککەوتنەکان ئەوانەن کە بەدەستی ناهێنیت."

مەشقی جڵەوگیریی هەستەکانت بکە

کلیلی بـەڕێوەبردنی هەسـتەکانت ئەوەیـە کـە زۆر بەباشـی لایـەنی دەروونـی خـۆت ئامـادە بکـەیت. مەشـق بـە خـۆت بکەیت. کاتێك دەچیت بۆ گفتوگۆکردنێك، بەقوڵی هەناسـە بدە. زۆر ئاگاداری خۆتبە و بەهێمنی بمێنـەرەوە، هـەروەك قەشـەیەکی بـودی. زۆر بەقورسـی و هەسـتیارییەوە لـە ڕێککەوتنەکە مەڕوانە. تواناکـەت بـۆ مانـەوەت بـەهێمنی و

جـێگیری کلیلێکــه بــۆ بــەهێزکردنی پێگــەی خــۆت لــە گفتوگۆکردنەکەدا. ئەوەت لەبیر بێـت کـە ئـەو کەسـەی زۆر هەسـتیارە سـەبارەت بـە بەدەسـتهێنانی دەرئـەنجامێکی دیاریکراو ئەوا کەسێکە کە کەمترین هێز و توانای هەیە.

# بەشی نۆیەم
# گرنگییەکانی کات لە بڕیارداندا

کـات و کـات دانـان کلیلـی سـەرەکین لـە گفتوگـۆکردنێکی کاریگـەردا. زۆرینـەی کـات دەتوانیـت باشـترین ڕێککـەوتن ئــەنجام بــدەیت ئەگــەر پێشــتر بەوریاییــەوە پلانــت بــۆ کاتەکانت دانابێت.

**نهێنییەکە ئاشکرایە**

بۆ نمونە کاتێك ئۆتۆمبێلێك دەکڕیت، ئەوا شـێوازێك هەیـە کــە دەتوانیــت بــەکاری بهێنیــت. بەڕێوەبــەر و کەســانی فرۆشیار چەند بەشێکیان هەیە کە دەبێت هـەموو مانگێـك تەواوی بکەن. ئەگەر لە سێ هەفتەی سـەرەتای مانگەکـەدا سەردانیان بکەیت، لەم کاتەدا هێشـتا فشـارێکی ئـەوتۆیان لەسـەر نییـە بۆ فرۆشـتنی بەشـەکانیان هـەر لەبـەر ئەمـە، داوای بەرزترین نرخی شیاو دەکـەن و هـیچ ئامـادەش نـین گفتوگۆ و مامەڵەی زیاتر بکەن.

باشترین کات بۆ کڕینی ئۆتۆمبێلەکە دووەم و سێیەم ڕۆژی کۆتــایی مانگەکەیــە. دەتوانیــت پێشــتر بچــیتە لای

فرۆشیارەکە و ئەو ئۆتۆمبێلەی کە دەتەوێت دیاری بکـەیت و تاقی بکەیتەوە. بەڵام چاوەڕێ بکـە هـەتاوەکو دوو سـێ ڕۆژی کۆتایی مانگەکە، بۆئەوەی گفتوگۆ بکەیت سـەبارەت بە نرخی کۆتایی و مەرجـەکان. ئـەوا لـەم کاتـەدا هەمیشـە باشترین ڕێککەوتنت دەست دەکەوێت.

چەند ساڵێك پێش ئێسـتا کـۆڕێکی فرۆشـتنم ئەنجامـدا بـۆ زیاتر لە هەزار کەس. ئەم هۆکاری کـات دانانـەم بـۆ کـڕینی ئۆتۆمبێل بۆ باسکردن، بۆ ئەو کەسانەی کە ڕەنگە بـیر لـە کـڕینی ئۆتۆمبێـل بکەنـەوە لـە داهـاتوودا. سەرسـام بـووم بەوەی کە لەناو بەشداربووەکاندا زیاد لـە سـەد فرۆشـیاری ئۆتۆمبێل هـەبوون کـە لـە چـەندین کۆمپانیـای جیـاوازەوە هاتبوون. زۆر تووڕە و شێتگیر بووبـوون بـەهۆی ئـەونهێنی ئاشکراکردنەوە. لەپاش تەواوبوونی کۆڕەکە بەدوام کـەوتن بــەهاوارەوە ســوێندیان دەدام کــە ئیــدی واز بهێــنم لــە ئاشکراکردنی نهێنیی فرۆشتنی ئەم ئۆتۆمبێلانە.

**ئاگاداری هەستی پێویستی و پەلەکردن بە**

ڕەنگە گرنگترین هۆکار لە کات داناندا بیکـەیت بـریتی بێـت لە پەلەکردن. هەتا زیاتر پەلەت بێت بۆ کڕینی ئـەو شـتەی

کە دەتەوێت، ئـەوا کـەمترین هێـزی سـەوداکردنت دەبێـت.
فرۆشیار و گفتوگۆکاری باش ئەوانەن کـە هـەموو هۆکارێـك
بــەکار دەهێــنن بــۆ دروســتکردنی هەســتی پێویســتی و
بەپەلەیی تاوەکو توانای کڕیارەکانیـان پـێ بـەئاگا بێـنن و
گفتوگۆیەکی سەرکەوتوو و کاریگـەر ئـەنجام بـدەن کـە لـە
بەرژەوەنــدیی خۆیــان بێــت. "ئەگــەر نــەمانتوانی بگەینــە
ڕێککــەوتنێك ئــەمڕۆ،" فرۆشــیارەکە دەڵێــت "تێکــڕای
نرخــەکان ســبەینێ بــەیانی دەگــۆڕدرێن" یـاخود دەڵێـت
"داشکاندنێکمان کردووە لەسەر ئـەم بابەتـە، بـەڵام ئـەمڕۆ
سـەعات ٥ داشـکاندنەکە نامێنێـت. لـەپاش ئـەوە نرخەکـە
دەگەڕێتەوە سەر نرخی تەواوی خۆی".
بۆ بەرهەڵستکردنی ئەم جۆرە تەکنیکە،کاتێك کەسێك پێیت
دەڵێت کە دەبێت خێرا بڕیار بدەیت مەگەر نـا ئـەم مەرجـە
گرنگـە لەدەسـت دەدەیـت، تـۆش وەڵام بـدەرەوە و بڵــێ:
"ئەگــەر پێویســت بێــت بــەخێرایی بڕیــار بــدەم، ئــەوا
وەڵامەکەم نەخێرە، بەڵام ئەگەر بوارم هـەبێت تـاوەکو بـیر
لە داواکەت بکەمەوە ئەوا ڕەنگە وەڵامەکە جیاواز بێت".

لــــه پێشـــتردا و لـــــه مێـــژووی ئـــەمریکادا، لقـــەکانی ئاگرکوژاندنەوە تایبەت بوو بە دووکانـدارە ناوخۆییـەکان و لەلایــەن ئەوانــەوە بــەڕێوە دەبــرا. کاتێــك ماڵێــك ئــاگری بگرتایە، دەبوو خاوەن ماڵەکە کەسێك بنێرێت بۆ لقی ئاگر کوژێنەرەوە و داوای ئاگرکوژێنەرەوەیەك بکات بە زووتـرین کات. کاتێـك ئاگرکوژێنـەوە دەگەیشـتە ماڵـە سـووتاوەکە، خاوەنی ئاگرکوژێنەوەکە لەبەرامبەر کوژاندنەوەی ئاگرەکـە لەگەڵ خاوەن ماڵەکـە دەسـتی دەکـرد بـە وتوویـژ و داوای بـڕە پارەیـەکی دەکـرد. هـەروەك دەزانـین خاوەنمـاڵ لـەم کاتـــەدا لـــە دۆخێکـــدا نییـــە بتوانێـــت وتووێژەکـــە لـــە بەرژەوەنـدی خـۆی کۆتـایی پـێ بێنێـت. هـەر لەبـەر ئـەم ناهاوسەنگییە بوو کە هەموو لقەکانی ئاگرکوژێنـەوە بوونـە خاوەن و بەڕێوەبەری شارەکە.

پەلە مەکە لە بڕیاردان

یــەکێکی دیکــە لــە تەکنیکــە بــەکارهێنراوەکان "پەلــە لێکردنە". ئەمە لە کاتێکدا ڕوو دەدات کە لایەنی بەرامبـەر هەوڵدەدات پەلەت لێبکات لە بڕیاردان بەرلەوەی دەرفـەتی ئەوەت هەبێت کە باشتر بیر بکەیتـەوە. هـەرکاتێك کەسێك

هەولێدا پەلەت لێبکات لە بڕیاردانەدا، تۆش دەتوانی بەرهەڵستی بکەیت و بڵێیت "ڕێگەم بدە تاوەکو بیرێکی لێدەکەمەوە لە کاتێکی دیکەدا بڕیارەکەمت پێ دەڵێم".

لە ڕاستیدا، گفتوگۆکەرە سەرکەوتووەکان، کات بەکار دەهێنن بۆ دواخستن. دواخستن سەختترین جۆری نکۆڵیکردنە. هەتا زیاتر گفتوگۆیەک یاخود بڕیاردانێک دوابخەیت بۆ دەستکەوتنی دەرئەنجامێك، ئەوا هێز وتوانایەکی زیاترت دەبێت. دواخستن لە گەیشتن بە ڕێککەوتنێك شێوازێکی بەهێزە کە دەتوانیت بۆ پارێزگاریکردن لە خۆت بەکاری بهێنیت. هەموو بڕیارە گرنگ و هەتەرەکان دوابخە لانیکەم بۆ ماوەی بیست و چوار کاتژمێر. تاوەکو بەرچاوڕوونیی زیاترت هەبێت و زیاتر بیری لێ بکەیتەوە. تا زیاتر بڕیاردان دوا بخەیت لە گفتوگۆدا ئەوا توانای بڕیاردانی باشترت دەبێت و لە کۆتایشدا ڕێککەوتنێکی سەرکەوتوو ئەنجام دەدەیت.

دانانی دوامۆڵەت بۆ کارێك

هۆکارێکی یارمەتیدەری دیکە لەبارەی کات و کات دانانەوە دوامۆڵەتە. هەر کاتێك شیاو بوو دوامۆڵەتێك بدە

به لایەنی بەامبەر تاوەکو بڕیاری تێدا بدەن، پێیان بڵێ کە ئەگەر لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا بڕیار نەدەن، ئەوا ڕێککەوتننامەکە لەدەستدەدەن. وە مەرج و خاڵ و دۆخەکەش دەگۆڕێت. و ئەو بەرهەم و خزمەتگوزارییەت دەدەین بە کەسێکی دیکە. هێرب کۆهن، باشترین گفتوگۆکەر و مامۆستای گفتوگۆکردن، چیرۆکێکی گرنگ و وانەیەکی بەنرخی ژیانی خۆی وەك جێبەجێکارێك دەگێڕێتەوە بۆمان و دەڵێت:" کاتێك کە گەیشتینە وڵاتی یابان، کۆمەڵێك لە خانەخوێ هاتن و خستمیانە نێو لیمۆزینەکە و بردمیان بۆ میوانخانەکەیان، وە پێیان وت کە بە باشی ئاگایان لە هەموو شتێکی دەبێت لەمیانەی گەشتەکەیدا و میوانێکی بەڕێزی ئەوانە. وە داوای بلیتی فڕۆکەکەیان لێکردبوو تاوەکو بزانن کەی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئامادەکاری کاری گەڕاندنەوەی بۆ بکەن. وە زانییان کە ماوەی شەش ڕۆژ لە یابان دەمێنێتەوە بەرلەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا."

بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ زۆر بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ کرد و خواردن و خواردنەوەیان بۆ ئامادەکرد. دەیانبرد بۆ گەشت

و گەڕان. بـەڵام هـەرگیز باسـی بازرگانییـان بـۆ نـەکردبوو. بەهۆی ئەو ڕێز و قسە خۆشییەیانەوە ئەمیش هـەوڵی دەدا کە تا دەتوانێت بەڕێز بێت لەگەڵیاندا. بەڵام هەتا کۆتـا ڕۆژ دەسـتیان نـەکرد بـە گفتوگـۆی هەتـەر و جـددی. کۆتـا وردەکارییـەکانی ڕێککەوتنەکـەیان لـەنێو ئۆتۆمبێلەکـەدا باسکرد کە دەیانبردەوە بۆ فڕۆکەخانە. ئەمەش وایکرد کـە خراپترین جۆری مامەڵە پەسـەند بکـات چـونکە نەیـدەزانی کە ئەمان کات لە دژی بەکاردەهێنن.

**یاسای ٢٠ لەسەر ٨٠ لە گفتوگۆکرندا**

لەگفتوگۆکردندا یاسای ٢٠ لەسەر ٨٠ بە شێوازێکی تایبەت پەیڕەو دەکرێت. ئەم یاسایە دەڵێت:" کە کۆتایی لە سـەدا بیستی هەر گفتوگۆیەك دەکرێت هەژماری لەسەدا هەشـتای هـەموو مـەرج و کێشـە و خاڵـە گرنگـەکانی سەرانسـەری مامەڵەیەك بکات. وە سەدا هەشتای سـەرەتای کفتوگۆیـەك تـەنها بـڕی سـەدا بیسـتی ئـەو کێشـانە دیـاری دەکـات کـە دەبێـت بڕیاریـان لەسـەر بـدرێت. دەبێـت ئـەوە پەسـەند بکەیت کە لە سەدا هەشتای سەرەتای گفتوگـۆکردن تـەنها لە دەوری خـاڵ و کێشـە ناگرنگـەکان دەسـوڕێتەوە. تـەنها

نزيك كاتی كۆتـايی گفتوگۆكـه و كاتێـك كـه خەريكـه كـات نامێنێـت، دێنـه سـەر قسـەكردن لەسـەر خـاڵ و مەرجـه گرنگـەكان و لـەژێر بـاری سـەرنجدا لـه كۆتايـدا مەرجـەكان پەسەند دەكەن.

ئـەوەی كـه مـن فێربـووم ئەوەيـه كـه پێويسـته لـەماوەی بەشـی سـەرەتای گفتوگۆكردنەكـەدا ئـارام بگريـت. هـيچ خاڵێك نييه كه وات لێبكات پەله بكەيت. ئەگـەر تـەنها دوو كاتـژمێرت هــەبێت بـۆ وتووێـژكردنی مامەڵەيـەك، ئـەوا گرنگترين خاڵەكان له سی چركەی كۆتايدا بڕيارييان لەسـەر دەدرێت، كەواته ئارامبه.

# بەشی دەیەم
# بزانە چییت دەوێت

زۆر سەیرە كە زۆرێك لە خەڵكی دەچنە گفتوگۆكردنەوە بەبێ زانینی ئەوەی كە دەیانەوێت چ شتێك بەدەست بهێنن، وە لەمیانەی گفتوگۆكەدا ئامانج و ویستەكانیان دیاری دەكەن. زۆر بەئاسانی كاریگەر و قایل، وە بەكاردەهێنرێن تاوەكو بە نرخێكی زۆر یاخود كەم شتەكانیان بكڕن یاخود بفرۆشن. چارەسەری ئەم جۆرە گیروگرفتانە بۆ تۆیە كە پێشتر بیر لە دەرئەنجامە خوازراوە نموونەییەكان بكەیتەوە ئەم پرسیارە لە خۆت بكە، "ئەگەر گفتوگۆیەكە لەبەرژەوەندیی مندا بێت، ئەوا چ دەرئەنجامێك بەدەست دەهێنم؟".

لەسەر كاغەز بیر بكەرەوە، وە لە پێشتر تەواوی ئەو شتانە بنوسە كە دەتەوێت. ئەو كەسانەی كە دەزانن بە تەواوی چییان دەوێت و ئەو شتانە دەنووسن تایبەتمەندییەكی ڕوون و ئاشكرایان هەیە بەسەر ئەوانەدا كە دوودڵن و نازانن چییان دەوێت.

**لەگەڵ ئەوانی دیکە بدوێ**

**هــــەرکاتێك گونجــــاو بــــوو، هــــەموو وردەکارییــــەکانی دەرئەنجامێکی نمونەیی لەگەڵ کەسێکی دیکە باس بکە. قسەکردن لەگەڵ کەسانی دیکە و بیرکردنەوە لەسەر کاغەز واتای ئەوە نییە کە تۆ ئەو بابەت و خزمەتگوزارییانەت بە (بەلاش) بێ پارە دەست دەکەوێت، یاخود ئەوەی کە تۆ ئامانجێك بەدی دەهێنیت کە زیان بە کەسانی دیکە بگەیەنیت. بە بیرکردنەوەی پێشوەختە لە گفتوگۆیەکە، ئەوا وادەکات زیاتر هەوڵی بەدەستهێنانی دەرئەنجامێك بدەیت کە تیایدا هەردوولایەن براوە و دڵخۆش و قایل بن. وەك بەشێك لە پرۆسەکە ئەو نرخە دیاری بکە کە بەنیازیت بۆ بەدەستهێنانی دەرئەنجامە نمونەییەکەت بیدەیت. بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی دەتەوێ لەم گفتوگۆکردنە یاخود لەم مامەڵەیەدا، چەندەت پارە ئامادەکردووە و بە چەندە قایل دەبیت؟**

**باشــــترین، ناوەنــــد و خــــراپترین دەســــتکەوتەکان (دەرئەنجامەکان)**

بـیر لــە ســیٚ ئاســتی شـیاوی دەرئەنجامــەکان بکــەرەوە: باشــترین، ناوەنــد وە خــراپترین. کاتێــك دەچــیت بــۆ کۆبوونەوەیــەکی ســەوداگەری واباشــترە کــە ئــەم ســیٚ دەرئەنجامــەت لــە هــزری خۆتــدا دانابێــت وە ئامانجــت بــۆ دەســتکەوتنی باشــترین و شــیاوترین نــرخ بێــت هــەر لــە ســەرەتاوە. هەمیشــە سەرســام دەبیــت بــەوەی کــە چــی ڕوودەدات کاتێـك بـە بـەرزترین نرخـی فرۆشـتن و نـزمترین نرخی کڕین دەستپێدەکەیت. هەندێك کـات، بـەهۆی چـەند هۆکارێکــەوە لایــەنی بەرامبــەر دەســتبەجیٚ لەگــەڵت ڕازی دەبێت و سەوداگەری زیاتری پێویست نییە.

دەرئــەنجامی ناوەنــد کــە پەســەندکراوە، وە ســێیەم دەرئەنجامیان خراپترینە کە ڕەنگە ڕووبدات. ئەگـەر هـاتوو ناچــاربوویت خــراپترین پەســەند بکــەیت، ئــەوە نــزمترین ئاستە کە پێی دەگەیت بەڵام هێشتا مامەڵەکـە بەردەوامـە. ئەمە پێی دەوترێت "کۆتا خاڵی کشانەوەت". لـەم ئاسـتە دەکشێیتەوە هەرچەندە پێشت نـاخۆش بێـت، بـەڵام ئەمـە نزمترین ئاستە کە پێیدا بڕۆیت. وە لە خوار ئەم ئاسـتەوە، ناتوانیت بەردەوام بیت. هەر لەبـەر ئەمـە پێشـتر بـەڕوونی

کـەمترینی شـتەکان دیـاری بکـە تـاوەکو بەتـەواوی ئامـادە دەبیت.

**لە بەرزترین ئاستەوە دەست بەکاربە**

لـــەکوێوە دەســـت دەکـــەیت بـــە گفتوگـــۆکردن؟ بـــەو دەرئەنجامـە دەسـتپێدەکەیت کـە باشـە یـاخود نمونەییـە. ڕەنگـە بەدرێـژایی ڕێگاکـەت پێویسـت بێـت کـەمێك بێیتـە ئاسـتی خـوارەوە، بـەڵام هەمیشـە بـە بـەرزترین ئاسـتەوە دەست بەکاربە کە ئارەزووی دەکەیت. گفتوگۆکەرەکان بـە بەکارهێنانی ئەم ڕێگـە و شـێوازە بـەناوبانگن. لـە یـەکێتی بەڵێننامـەی گفتوگۆکردنـدا، گفتوگۆکەرەکـە بـە داواکردنـی زیادکردنی ڕێـژەی لـە سـەدا پـەنجا بـۆ یـەك ساڵ دەسـت بـــەکار دەبێـــت، لەگـــەڵ چـــاودێری پزیشـــکی، موچـــەی خانەنشـــینی وە ســـوودی دیکـــەش. ئەمـــە وەك کـــەمترین داخوازییان پێشکەش دەکەن بۆ بەڵێننامەیـەکی نـوێی بـە ئەندامبونیان. بە تێپەڕبوونی کات، ئـەوە پەسـەند دەکـەن کە لە سەدا پێـنج زیادەیـان پێبـدرێت بـۆ دوو سـاڵ، بـەبێ بیمەی پزیشکی وە یـاخود پلانـی خانەنشـینی. لـە پاشـان

دەگەڕێنەوە لای ئەندامەکانیان و وە ئەمـە بـە سـەرکەوتنی مەزن ناودەبەن.

پێشتر بیر لـە باشـترین، ناوەنـد و خـراپترین بارودۆخـەکان بکەرەوە، بۆئەوەی بەتـەواوی ڕوون و دڵنیابیـت سـەبارەت بـەوەی کـە دەتـەوێت و ئـەوەی کـە ناتـەوێت پەسـەندی بکـەیت. لـە پاشـان بـە دەرئەنجامـە نمونەییەکـەت دەسـت بەکاربیت و لێرەوە دەست بە گفتوگۆکردن بکەیت.

# بەشی یازدەیەم
# پرۆژەی گفتوگۆی زانکۆی هارڤارد

زانکـۆی هارڤـارد و دەسـتەی بـەڕێوەبردنی، هـەزارەها گفتوگـۆی گـەورە و بچـوکیان ئەنجامـداوە، لـە هـەردوو بوارەکانی بازرگانی و سیاسیی نێوخۆیی و جیهانیدا. چوار کلیلی سەرکەوتوویان بۆ پێناسە کردووین.

١- خـەڵکی(کەسـەکان): کلیلێـك بـۆ گفتوگۆیـەکی سـەرکەوتوو ئەوەیـە کـە کەسـایەتیی کەسـەکان جیـا بکەیتەوە لەو کێشە و گرفتانـەی کـە دێنـە پـێش. هـەرگیز هەستیار مەبە، هەموو کات هزر و چاوەکانت لەسەر بابەتی گفتوگۆکردنەکـە بهێڵـەرەوە، هـەرگیز مەهێڵـە بـەهۆی کەسایەتییە ئەرێنی و نەرێنییەکانەوە هێڵگەکەت لاببرێت.

٢- خواست و ویستەکان: بە پێشکەشکردن و خستنە بەرچـاوێکی ڕوونـی خواسـت و ویسـتەکانی هەردوولایـەن

دەست بە گفتوگۆکردنەکە بکەن. بەرلەوەی لیستی ئەو شتانە بنوسیت کە دەتەوێت. لیستی ئەو دەرئەنجامانە بنوسە کە هەوڵ دەدەیت بەدەستی بهێنیت. پاشان بڕیاربدە کە دەتەوێت لە گفتوگۆیەکدا چییت دەست بکەوێت تاوەکو ئامانجەکەت بەدی بهێنیت. کاتێك لەگەڵ لایەنە جیاوازەکاندا دادەنیشیت، تەنانەت لەپێش ئەوەش، ئەوا هەندێك کات تەرخان بکە بۆئەوەی بزانیت بەڕوونی هەموو خواست و ویستەکانی لایەنی بەرامبەرت چین و دەیانەوێت لەم گفتوگۆکردنەدا چی بەدەست بهێنن. پێیان بڵێ:"بە بۆچونی ئێوە، ئەگەر ئەم مامەڵەیە ئەنجام بدرێت، لە کۆتایدا چ دەرئەنجامێکمان بەدەست دەکەوێت؟".

٣- بژاردەکان: بەرلەوەی بچنە گفتوگۆکردنەوە لەسەر خاڵە جیاوازەکان هەموو ئەو بژاردانە دیاری بکە لەم بوارەدا کە لەگەڵیاندا هاوڕانییت. چەندین ئەگەر و شیاوی گونجاو دروست بکە. شێوازی ئاڵوگۆڕکردنی بیرورِا بەکاربهێنە بۆ گەشەدان بە شێوازە گۆڕدراوەکان وە

دەتوانیـــت نەخشـــەی هـــزری، یـــاخود داتاشـــۆیەك بەکاربهێنیت.

٤- پێوانە و بنچینەکان: بەشێوەیەکی گشتی ئەمانـە پێیـان دەوترێـت "مەرجـە سـنوورییەکان". بەرلـەوەی گفتوگۆ بکەیت، دەبێت ئەوە پەسەند بکەیت کـە ئـەنجام و دەرئەنجامـەکان لەسـەر بنـەمای ئامـانجێکی سـەرەکی دابنرێـت. بڕیـاری چـی دەدەیـت کاتێـك گەیشـتنە ڕێککەوتنێکی باش بۆ هەردوولایەن؟ ئـەو شـتانە چـین کـە دەتەوێت بەدەستیان بهێنیت یاخود ئەوانەی کە دەتـەوێت لێیان دوور بکەویتەوە؟

هەر کە تەواو دڵنیا بوویت لەوەی کە دەتـەوێت و چ شـتێك پێویسـتە لـەم گفتوگۆیـەدا هـەتاوەکو هەردوولایـەن دڵخۆشـبن، پاشـان بـەراوردی بـژاردە و دەرئەنجامـە جۆراوجۆرەکان بکە لەگـەڵ خـۆت خواسـت و ویسـتەکاندا. بڵێ، "ڕێککەوتنێکی بـاش پێویسـتی بـەم مەرجانـە هەیـە. ئەمانـــە دەرئەنجامـــەکانن و ئـــەم ئامانجـــە بەدەســـت دەهێنین". بەشێوازێکی دیکە دەتوانین بڵێین، تـۆ وێنـەی

ڕێککـەوتنێکی بـاش و سـەرکەوتوویان بـۆ دەکێشـیت کـە هەردوولا دڵخۆش بن.

لە کۆتایـدا هـەموو ئـەو ڕێگـا و شـێوازانە دەخەیتـەڕوو کـە دەتـــوانن لـــە ڕێیـــەوە خواســـت و پێویســـتییەکانی ڕێککەوتنەکە بەدی بهێنین. ئەمە پرۆسـەیەکی بـەهێزە بـۆ گفتوگـۆکردن کـە هـەموو هـزر و جـەختت بەتـەنها لەسـەر ئامانجەکان دەهێڵێتەوە دەتپارێزێت لەوەی کـە کـارتێکراو بیت بە کەسایەتی و کێشە و گرفتە ڕووکەشییەکان.

# بەشی دوازدەیەم
# ئامادەکاریی پێشوەختە کلیلی هەموو کارێکە

ئامادەکـاری نیشـانەی ڕاسـتەقینەی کەسـانی کارامـە و پیشەگەرە. لە سەدا هەشتای گفتوگۆ سەرکەوتوو دەبێـت، ئەگـەر لەسـەر بنچـینەی ئامادەکـاریی پێشـوەختە بنیادبنرێت لەلایەنی تۆوە.

بـە ڕەچـاوکردنی بابەتـەکان دەسـت بەکاربـە: بـەنیازی سـەبارەت بـە چـی قسـە بکـەیت؟ ئامـانج و مەبەسـت لـەم گفتوگۆیە چییە؟ بەڕوونی ئەوانە نیشان بدە کە دەتـەوێت بەدەسـتیان بهێنیـت وە هـەموو گیروگرفتـەکان چـین کـە ڕەنگـە بێنـە ئـاراوە؟.ئامـانج و ویسـتەکانی تـۆ لـەم گفتوگۆیەدا چین؟ دەتەوێت چی بەدەست بهێنیـت کاتێـك دەچیتە ناو ئەم وتووێژکردنەوە؟ هەتا ئامانجـەکانت زیـاتر ڕوون و ئاشـکرابن، ئـەوا خێراتـر بەدەسـتیان دەهێنیـت و ئاسانتر دەتوانیت بیگەیەنیت بە لایەنی بەرامبەر.

هەبوونی بژاردەکان واتا هەبوونی ئازادی

هەبوونی بژاردە ڕەنگە باشترین هاوڕێت بێت لە گەیشتن بە باشترین ڕێککەوتن لە هەرجۆرە گفتوگۆکردنێکدا. هەتا بژاردەی زیاترت هەبێت، ئازادیش زیاتر دەبێت بۆئەوەی باشترین بڕیار بدەیت. لە گفتوگۆکردندا تەنها کاتێك ئازادیت کە پەرە بە بژاردەکانت بدەیت.

ئەگەر لە پێشتردا بژاردەی پەرە پێدراوت نەبێت، ئەوا تەنها هەڵبژاردەت ئەوەیە کە هەرچییەك لایەنی بەرامبەر بیڵێت، پەسەندی بکەیت. دەستەکانت دەبەسترێن. بەڵام ئەگەر هاتوو چەندین بژاردە و ڕێگای جۆراوجۆرت هەبێت کە بتوانی پیایدا بڕۆیت، ئەوا لە پاشاندا ڕێککەوتنێکی مەزن دەبێت. چەندین ئەگەری گۆڕا و شیاو دابنێ، لەسەر کاغەز وە بەرلەوەی بچیتە گفتوگۆکردنەکەوە زۆر بەوردی بیریان لێبکەرەوە.

**بەردەوام پەرە بە بژاردەی زیاتر بدە**

زۆر بەورياييەوە هەموو هەوڵێك بدە و بەدواداچوون بکە بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی دیکەی بەرهەم و خزمەتگوزارییەکان. ئەوە بزانە کە پێویستە چی بۆ بدەیت، وە کات و بەرواری گەیشتنەکەی کەی دەبێت. بە

هـــەبوونی بـــژاردەکانت دەتوانیـــت زۆر بـــەهێمنی و لەســـەرخۆییەوە بچـــیتە گفتوگۆکردنـــەوە، کـــە ئەمـــەش واتلێـدەکات هێـزی خـۆگری و گـویْ پێنـەدانت زیـاد بکـات لەمیانەی گفتوگۆکەدا.

کاتێـك زنجیرەیـەك لـە بـژاردەی ڕێکخـراوت هەیـە، ئـەوا بەتەواوی ئازادیت لەوەی کە هـەر مـەرج و خـاڵێکی لایـەنی بەرامبـەرت پەسـەند بکـەیت یـاخود ڕەتـی بکەیتـەوە. لـە ئەنجامدا هەمیشە باشترین ڕێککەوتن ئەنجام دەدەیت.

هەتا دەتوانیت فێربە

یـەکێك لـە کلیلـەکانی ئامادەکـاری ئەوەیـە کـە هەنـدێك بەدواداچـوون بکـەیت بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە گفتوگۆیـان لەگەڵ ئەنجام دەدەیت. لە ئەمڕۆدا، باشـترین ئامڕازێـك بـۆ ئامادەکـاریی پێشـوەختە بریتییـە لـە ئینتـەرنێت وە بـە تاییـەتیش گووگــڵ. زۆر سەرســووڕهێنەرە کـــە بەتـــەنها داگـــرتنی دوو پەنجـــەت دەتوانیـــت چـــەندین زانیـــاری بدۆزیتەوە.

زۆرجار، کەسێکی دیکـە دەناسـیت کـە گفتوگـۆی کـردووە یـاخود کـارێکی بازرگـانی لەگـەڵ ئـەو کەسـانەدا کـردووە.

پەیوەندییان پێوە بکە، بارودۆخەکەیان بۆ ڕوون بکەرەوە و داوای ئامۆژگارییان لێبکە. هەندێکجار تەنها یەك ئامۆژگاری یاخود بەرچاوڕوونی دەکرێت سوودێکی یەکجار زۆری هەبێت بۆ گفتوگۆی داهاتوو.

**هەندێك پەیوەندیی تەلەفۆنی ئەنجام بدە**

هاوڕێیەکم دەیویست کۆمپانیایەکی پیشەسازی بکڕێت. ئەم کۆمپانیایە زنجیرەیەك لە بەرهەمی هەبوو کە بەتەواوی گونجاو بوو لەگەڵ کۆمپانیاکەی ئەودا. خاوەنی کۆمپانیاکەی دیکە داوای چەند ملیۆن دۆلارێکی دەکرد بۆ بازرگانییەکەی وە چەندین مەرج و خواستی هەبوو بۆ دوای فرۆشتنەکە. هاوڕێکەم بانگی بانکەوانەکەی خۆی کرد و پرسیاری لێکرد کە هیچ کەس ناناسێت لە بانکی ئەو کۆمپانیایەی دیکە. وا ڕێککەوت کە بانکەوانەکان یەکیان دەناسی و پەیوەندی پێوەکرد. وە بەنهێنی بەدواداچوونی بۆ کرد، بۆی دەرکەوت کە ئەو کۆمپانیایە لە بارێکی ماددی ترسناکدایە، وە ئەگەر بەڕێوەبەرەکە لەماوەی چەند ڕۆژێکدا کڕیارێك یاخود سەرچاوەیەکی دارایی نوێ نەدۆزێتەوە ئەوا بانك ناچار دەبێت کە کۆمپانیاکە دابخات.

تەنها بەهۆی ئەم زانیارییەوە، هاوڕێکەم توانی کە لەگەڵ خاوەن کۆمپانیاکەدا دابنیشێت و گفتوگۆی ڕێککەوتنێکی یەکجار باش بکات. توانی بەرامبەر بڕە پارەیەك کۆمپانیاکە بکڕێت، وە دەست بگرێت بەسەر هەموو قەرزەکاندا، و بەو قازانجەی کە لە بازرگانییەکە دەمێنێتەوە، پارەی خاوەن کۆمپانیاکە دەدات.

**گریمانە پرسیارەکان**

پیتەر دراکەر نوسیویەتی کە " گریمانە ناڕاست و نادروستەکان سەرچاوەی هەموو شکستێکن". ئەگەرە ناڕاستەکان سەرەکیترین هۆکارن بۆ ڕازینەبوون و هەڵە تێگەیشتن لە گفتوگۆکردندا.

زۆربەی ئەو کاتانەی کە لە گفتوگۆکردندا بەسەر دەبرێن، بۆ چارەسەرکردنی گریمانەیەکی نادروستە بەجۆرێك لە جۆرەکان. بەرلەوەی دەست بە گفتوگۆکردن بکەیت لەخۆت بپرسە، " گومان و گریمانەکانم چین؟" با زیاتر تایبەتی بکەینەوە: ئەگەرە دیارەکانت چین؟ ئەگەرە ناڕوون و نادیارەکانت چین؟ گریمانە دیار و نادیارەکانی لایەنی بەرامبەرت چین؟ ئایا هاوبەشەکانت وای دادەنێن

که بەڕاستی دەتەوێت ئەم گفتوگۆیە ئەنجام بدەیت؟ ئایا ئەوان بەشێوەیەکی دۆستانە و گوێپێنەدەر یاخود نەیار دەتبینن؟ ئایا وەك کەسێکی باش یان کەسێکی نادروست دەتبینن تاوەکو مامەڵەت لەگەڵ بکەن؟

**هەڵسەنگاندن بۆ گریمانەکانت بکە**

گرنگترین شت، دەکرێت گریمانەکانت هەڵەبن؟ ئەگەر هەڵەبن چی ڕوودەدات؟ ئەگەر گریمانەکانت هەڵە بوون ئەوا چی دەکەیت بۆ گۆڕینی مەرج و خواستەکان؟

یەکێك گریمانەکان کە دایدەنێین کاتێك دەچنە گفتوگۆیەکەوە ئەوەیە کە لایەنی بەرامبەر بەڕاستی دەیەوێت کۆتایی بە ڕێککەوتنەکە بهێنێت. وە هەندێك جاریش ئەمە هۆکار نییە، ئەوانی دیکە ڕەنگە گفتوگۆ لەگەڵ بکەن بۆئەوەی پەرە بە مەرجەکانی گفتووگۆکردنەکەیان بدەن لەگەڵ ئەو لایەنەی کە دەیانەوێ بەڕاستی ڕێککەوتنی لەگەڵ بکەن. ئەوان دەیانەوێت گفتوگۆت لەگەڵ بکەن بۆئەوەی باشترین ڕێککەوتنێك بکەن بەرلەوەی ئەو ڕێککەوتنە ویستراوەیان لەگەڵ کەسێکی دیکە بکەن. هەر لەبەر ئەمە، بیربکەرەوە

کـه چـۆن دەتوانیـت ئەگـەرەکانی هەردوولایـەن ڕوون بکەیتـــەوە بەرلـــەوەی بچـــیتە نێـــو درێـــژەی گفتوگۆکردنەکەوە.

## گیرو گرفتە سەرەکییەکان دیاری بکە

لەکۆتایـدا لـە ئامادەکاریـدا بـۆ گفتوگـۆکردن، بپرسـە، گیروگرفتـە سـەرەکییەکان چـین؟ لەکوێـدا جیـاوازین لـە ویست و پێویستییەکانمان؟ ئەو بوارانە کامانـەن کـە تێیـدا ڕێکناکەوین؟ ئەو دەرگایانە چین کە دەبێت قسـەی لەسـەر بکەین و چارەسەری بکەین؟

هەتاوەکو وریاتر بیت لە خۆئامـادەکردن بـۆ گفتوگـۆکردن، ئەوا هێزی زیاترت دەبێت، وە ڕێککەوتنی باشـتر دەکـەیت. کلیلـی خۆئامــادەکردنیش بریتییـە لـە بەدواداچـوون بـۆ دۆزینـەوەی ڕاسـتییەکان. ڕاسـتییە ڕاسـتەکان بەدەسـت بهێنە نەك گریمانەکان. بیرت بێت زانین هێزە.

# بەشی سیازدەهەم
# بارودۆخ و پێگەی خۆت و ئەوانی دیاری بکە

بارودۆخ و پێگەکەت خاڵی دەستپێکن. پێکهاتووە لەوەی کە لەکوێوە هاتویت، بۆکویێ دەچیت وە دەتوانیت چەندە زۆر یاخود کەم دەتوانیت پەسەند بکەیت. ئەمانە خاڵە بنچینەییەکانتن "مەرجە سنوورییەکانت" هەروەك لە بەشی پرۆژەی زانکۆی هارڤاردا باسمانکرد. ئەمانە ئەو هۆکارو سنورانەن کە دەبێت لەگەڵیان بگونجێیت و چارەسەریان بکرێت لە ڕێککەوتنەکەدا. پێگەکەت پێکدێت لەباشترین و خراپترین دەرئەنجامەکان، لەگەڵ نزمترین و بەرزترین نرخدا کە دەتوانیت پەسەندی بکەیت لە گەیشتن بە ڕێکەوتنێکدا.

**ڕوونی و ئاشکرایی بەهێزترینە**

مەرج و خواستە سەرەکییەکانت چین بۆ گفتوگۆیەکی سەرکەوتوو؟ لەم پرۆسەیەدا دەبێت چییت دەست بکەوێت تا بیکەیتە پرۆسەیەکی سەرکەوتوو؟ ئەو شتە گرنگانە

چـین کـه نابێـت وازیـان لـێ بهێنیـت کـه ئەگـەر هەرچـیش ڕوویدات؟ ئەو شتانە چین کە پێیـان قایـل دەبیـت تـاوەکو پێویستییەکانی خۆتی پێ دەستەبەریکەیت؟.

ئەو ماف و ڕەوا پێدراوانە چین کە داوایان دەکـەیت یـاخود دەیانبەخشـــیت؟ یاســـاکە ئەوەیـــە کـــە هـــەرگیز لـــە گفتوگۆکردنـدا دەسـت لـە شـتێك هەڵنـەگریت هـەتا لـە بەرامبەردا داوای شتێکی دیکە نەکەیت. ئەگـەر دەسـت لـە هـەر شـتێك هـەڵبگریت و لەبەرامبـەردا داوای هـیچ شـتێك نەکەیت، ئـەوا لایـەنی بەرامبـەر ئەمـە وەك خـاڵێکی لاوازت دەبینێت و داوای شتی زیاتر دەکات. لەو ئاڵوگۆڕکردنەدا.

**بزانە مامەڵە لەگەڵ چیدا دەکەیت**

خواست و دەرئەنجامـە سـەرەکییەکانی لایـەنی بەرامبـەرت چـین؟ ئایـا هـەموو شـت شـیاوە بۆئـەوەی کەمینـەی و زۆرینەییەکانی لایەنی بەرامبـەری پـێ دیـاری بکرێـت. لـەم گفتوگۆیەدا بەتەواوی دەبێت چـی بەدەسـت بهێـنن و پێـی بگەن؟ ماوەیەك پێش ئێستا گفتوگۆی کرێنامەیەکم کرد بۆ شـوێنی نوسـینگەیەك. لـەدوای هەنـدێك بەدواداچـوون بـۆم

دەرکـەوت کـە خاوەنەکـەی بـە چـەند مـەرجێك دەتوانێـت کرێنامەکە ئەنجام بدات. دەبوو کە بڕە پارەیەك وەربگرێـت لە کرێنامەکەدا ئەگەرنا بارمتەی خانووبەرەکە ڕازی نابێت. بەم زانیارییە، زانـیم کـە پێویسـتییە تایبەتـەکانی خـاوەن موڵکەکە چین. چەندین هۆکار هەن لە ڕێکەوتنی کرێنامـەدا کە دەکرێت لەلایەن خاوەن زەوییەکانەوە گفتوگۆی لەسەر بکرێـت. بــەڵام بەکرێــدانی موڵکــەکان لەلایــەن بارمتــەی خانووبەرەوە دەسـتی بەسـەردا گـیراوە. دەمتـوانی لەگـەڵ خــاوەن موڵکەکــە باســی بــڕی کرێــی خــۆڕایی و شــوێنی وەسـتانی ئۆتۆمبێـل و هەنـدێك شـتی دیکـە بکـەم، بـەڵام دەبـوو کرێکـە لـە ئاسـتێکی دیـاری کـراودا بێـت ئەگـەر نـا پەسەند نەدەکرا.

وە هەروەها ئەوەشم زانـی کـە خـاوەن بیناکـە بـە بـارێکی مـاددی سـەختدا تێدەپـەڕێت، وە هـەر لەبەرئەمـە، دەبـوو لەماوەیەکی کەمدا زیـاد لەسـەدا هەشـتای بیناکـان بـەکرێ بدات. زانینی ویست و پێداویسـتییەکانی خـاوەن موڵکەکـە بووە هۆی ئەوەی کە من بتوانم گفتوگۆیەکی باشتر ئـەنجام بدەم.

**بارودۆخەکە پێچەوانە بکەرەوە**

یــــەکێك لەباشـــترین ڕێگاکـــــان بـــۆ پـــــەرەدان بـــە دەرئەنجامــەکانی، هــەر گفتوگۆیــەك ئەوەیــە وتووێــژی کێشــەی ڕکابەرەکـەت بکـەیت بەرلـەوەی ئامادەکـاری بـۆ کێشە و دۆخی خۆت بکەیت.

لەکۆلێـژی یاسـادا، قوتابییـەکان فێـری ئـەوە دەکـرێن کـە کەیسـی لایـەنی بەرامبـەر وەربگـرن و بەتـەواوی گفتوگـۆی لەسەر بکەن بەلەبەرچاوگرتنی ڕاستییەکانی کەیسەکە وەك بڵێی کە کار بۆ لایـەنی بەرامبـەر دەکـەن. لـەدوای ئـەوەی کەیسی لایەنی بەرامبەریان ئامـادەکرد دەسـت دەکـەن بـە ئامادەکردنی کەیسەکەی خۆیـان. ئـەم مەشـقکردنە هێـز و توانـا دەداتـە پـارێزەر و گفتوگۆکـارە ئاسـت بـەرزەکانی تاوەکو بەڕاستگۆی و بێلایەنانە بیربکەنـەوە لـە بـەهێزی و لاوازی ڕکابەرەکەیان و بڕیاریان لەسـەر بـدەن. ئـەم جـۆرە تەکنیکـە دەتوانێـت بەرچـاوڕوونییەکی باشـترت پێبـدات لەسەر ئەو شتانەی کە لەگەڵ لایـەنی بەرامبـەردا بـەنیازیت وتووێــژی لەســەربکەیت و توانــای مەزەنـدەکردنی ئــەو

شتانەی لایەنی بەرامبەر دەیانەوێت زیاتر دەکات و هێزی گفتوگۆکەشت زیاتر دەبێت.

هەمیشە بارودۆخەکان پێچەوانە بکەرەوە بەرلەوەی دەست بەکاربیت. خۆت لە جێگای لایەنی بەرامبەر دابنێ. وایدابنێ کە تۆ کەسەکەی دیکەیت و دەتەوێت باشترین ڕێکەوتن ئەنجام بدەیت لەم گفتوگۆکردنەدا. ئەگەر تۆ کەسی بەرامبەر بیت ئایا داوای چی دەکەیت؟ بەهێزی و لاوازییەکانی بارودۆخەکەت چین؟ چی شتێك زۆر گرنگە و چی گرنگ نییە؟

**وانەکان لە گفتوگۆکردنی کرێنامەیەکدا**

خەریکی گفتوگۆکردنی کرێنامەی نوسینگەیەکی نوێ بووم، لەبەرامبەر خاوەن موڵکێك کە داواکارییەکی زۆر و گرانی هەبوو. خاڵی لاوازی من ئەوەبوو کە دەمویست لە نوسینگەکانمدا بمێنمەوە، بەڵام نەمدەویست خۆم بە کرێنامەیەکی پێنج ساڵی ببەستمەوە و بتوانم بڕۆم بۆ شوێنێکی گەورەتر یاخود بچوکتر هەرکاتێك پێویست بێت. لەپێش گفتوگۆکردنەکە، دانیشتم و پارچە کاغەزێکم هێنا و هەموو ئەو شتانەم تێدا نوسی کە ڕەنگە خاوەن

مۆڵکەکە داوای بکات. وە نزیکەی بیست شتم تێدا نوسی. وە لە پاشان لەسەر کاغەزێکی دیکە هەموو ئەو شتانەم نوسی کە خۆم دەمەوێت. تاوەکو ئەمڕۆش، زۆرجار سەرسوڕماو دەبم لەوەی کە چەندە باشتر دەتوانم گفتوگۆ بکەم و ڕێککەوتنی باشتر بکەم بەوەی کە پێشتر خۆم بخەمە شوێنی لایەنی بەرامبەر. لەبری ئەوەی چەندین کاتژمێر بەسەربەرم لە گفتوگۆکردنەکەدا، تەنها لەماوەی سی خولەکدا هەموو کێشە و گرفتەکانمان چارەسەرکرد.

**بەرلەوەی دەستبەکار بیت بیر بکەوە**

لەهەر گفتوگۆکردنێکدا کە ئەم شێوازەم بەکارهێنابێت ئەوا دەرئەنجامەکانی بەهەمان شێوە بوون. هەمیشە باشترین ڕێکەوتنم کردووە بۆ خۆم و بارودۆخێکی بردنەوەی دوولایەنەم بۆ هەردوولا فەراهەم کردوە. ئەوەت لەبیربێت لە گفتوگۆکردندا، هەر لایەنێك چەند کێشە و گیروگرفتێکی هەیە کە زۆر گرنگن وە هەندێکی دیکە کە کەمتر و کەمتر گرنگن. هۆکاری سەرکەوتنی گفتوگۆیەك ئەوەیە کە هەردوولایەن بتوانن ئامانجە سەرەکییەکانیان بەدەست بهێنن لەکاتی سازشکردنی ئامانجە کەم گرنگترەکان بە

نوسینی هەموو ئەو ئامانجە گەورە و بچوکانە لەسەر کاغەز وەبەر لەوەی دەستبەکاربیت، ئەوا دەتوانیت بەشێوەیەکی ڕونتر بیر بکەیتەوە و گفتوگۆیەکی کاریگەرتر ئەنجام بدەیت و ڕێکەتنێکی باشتر دەست بکەوێت.

باشترین دەرئەنجامەکان بۆ هەموان

چەند ساڵێك پێش ئێستا، ئامادەکاریی گەشتێکم دەکرد بەرەو نیویۆرك. بۆ گفتوگۆکردنی مامەڵەیەك کە داهاتەکەی سەدان هەزار دۆلار بوو بۆ من. دانیشتم و کاغەزێکم هێنا هەموو خاڵ و مەرج و چارەسەرە نمونەییەکانم لەسەری نوسی.

بەدرێژای ڕۆژ دانیشتین و گفتوگۆمان لەسەر خاڵەکانی ڕێککەوتنەکە کرد. بەڵام بەرلەوەی مامەڵەکە دەستپێ بکەین لە بەرامبەرەکەم پرسی "ئەگەر ئەم گفتوگۆکردنە بەتەواوی سەرکەوتوو بوو، ئەوا باشترین دەستکەوتەکانی بۆ ئێوە چی دەبێت؟"

هەرچەندە زۆر سەریان سوڕما لە پرسیارەکەم، بەڵام بە ڕاستگۆیانە وەڵامیان دامەوە. ئەگەر ئەم ڕێککەوتنە سەرکەوتوو بێت، ئەوا بەم نرخە دەبێت، ئەمانەش

مەرجەکان دەبن. ئەمانە ئەو شتانە بوون کە لە مێشکی خۆیاندا وایان دانابوو بۆ هەردوولامان باشترینە. لەبەرامبەردا، منیش مەرج و ویستەکانی خۆمم پێ وتن کە زۆر دوور نەبوون لە ئامانجەکانی گفتوگۆکردنەکە. هەر بۆیە زۆر بەخێرای لەسەر هەموو وردەکارییەکان ڕازی بووین و کۆتاییمان بە کێشە سەرەکییەکان هێنا. لەبری هەشت کاتژمێر بەتەنها لەماوەی دوو کاتژمێردا کۆتایمان بەتەواوی گفتوگۆکردنەکە هێنا و هەردوو لایەن زۆر دڵخۆش و قایل بوون لە کۆتایدا.

# بەشی چواردەهەم
# یاسای چوار بابەتە گرنگەكە

لەمیانــەی پێداچــوونەوەمان بــۆ هــەزارەها گفتوگــۆكردن، هەردووك سادە و گران، بۆمان دەركەوت كە هەمیشە چـوار بابەت یـاخود كێشـە و گرفـت هـەن كـە دەبێـت لـە هـەموو گفتوگۆیەكدا بڕیاری لەسەر بدرێت. ڕەنگە شتی بچوكتریش زۆر هەبن بەڵام هەمیشە چوار دانەی سەرەكی هەن.

جارجار دەكرێت یەك، دوو، سێ یاخود تەنانـەت پێنجـیش هەبێت، بەڵام ئەم یاسایە دەڵێت كـە هەمیشـە تـەنها چـوار دانــەیان ســەرەكین. كــاری تــۆ ئەوەیــە كــە بــەوردی بــیر بكەیتەوە و بزانیت ئەو چوار شتە گرنگە دەبێت چی بێـت، بـۆ هــەردوولا، هــەم خــۆت هــەم لایــەنی بەرامبــەرت، وە هــەروەها دەتوانیــت چــی بكــەیت تــاوەكو بەشــێوەیەكی كاریگەرانە مامەڵەیان لەگەڵ بكەیت.

هەمیشــە دۆزێكــی ســەرەكی زۆر گــرنگ هەیــە لەگــەڵ ســێ دۆزی لاوەكـــی دیكـــە كـــە گـــرنگن بـــەڵام وەك دۆزە

سەرەکییەکە نا. بۆ نمونە کاتێک دەتەوێت خانوویەک بکڕیت، یەکەم شت کە بەلاتەوە گرنگە خانووەکەیە،نەخشەی خانووەکە، جوانی و دڵڕفێنییەکەی و شوێنەکەیەتی. لەپاشان ئەوەی گرنگ بێت نرخەکەیەتی، پارەدان و مەرجەکان لەگەڵ ئەو شتانەی کە بۆ کڕینی خانووەکە پێویستن. نمونەیەکی دیکە،کاتێك دەتەوێت ئۆتۆمبێلێکی نوێ بکڕیت، یەکەم شتێك کە گرنگی پێبدەیت مۆدێل و ڕەنگ و قەبارەی ئۆتۆمبێلەکەیە. بەلاّم لەبەرئەوەی کە دەتوانیت هەمان ئۆتۆمبێلە لەلایەن زیاتر لە فرۆشیارێکەوە بکڕیت، ئەوا ئەو بابەتانەی کە دەکرێت گفتوگۆی لەسەر بکەیت نرخەکەی و پارچە زیادەکانی و مەرجەکانی پارەدانەکەیەتی.

هەرکە بڕیارتدا ئۆتۆمبێلێکی دیاریکراو بکڕیت ئەوکات ڕەنگە گرنگترین شت نرخە تەواوەکەی بێت. پاشان دەکرێت گفتوگۆ لەسەر ئاڵوگۆڕکردن بکەیت بەو ئۆتۆمبێلە و ئۆتۆمبێلەکەی خۆت وە پێدانی بڕی پارەی زیادەشی، دواتریش ئەوەی گرنگە لات پارچە و بەشە زیادەکانە وە ئەو بڕە پارەی کە ئارەزوومەندی بیدەیت.

**کێشه له گفتوگۆکردندا (گێژاوی گفتوگۆکردن)**

لـــه گفتوگۆکردنـــدا، هـــەر لایـــەنێك کێشـــه یـــاخود دۆزی ژمارەیەکی هەیه که جیاوازە لـه کێشـه و دۆزی لایەنەکـەی دیکه. ئەگەر هەردوولا هەمان کێشـەی سـەرەکییان هـەبێت ئەوا گفتوگـۆکردن و گەیشـتن بـه ڕێککـەوتن زۆر مـەحاڵ و دژوار دەبێت.

بۆ نمونه، لەماوەی ساڵی ١٩٤٧ لـه ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت، وتوویـژ و گفتوگۆیـەك لـه نێـوان ئیسـرائیل و فەلەسـتیندا ئەنجامـدرا. کێشـەی سـەرەکی هـەردوولایان زەوییـەکانی ئیسرائیل و مانەوەی دەوڵەتی ئیسرائیل بوو لەوێدا. دۆزی ژماره یەکی ئیسرائیل بەردەوام بوون و مانـەوەیان بـوو لـه شوێنی خۆیان. وه دۆزی ژماره یەکی فەلەسـتین نەهێشـتن و چۆڵکردنی ئیسرائیل بوو لەوێدا.

هـەر لەبەرئـەوەی ئەمـه وەك مـەرجی سـەرەکی هـەردوولا مایەوە، گفتوگۆکان هـەر بـەردەوامییان هەیـه بـەڵام ئـەوە چەندین دەیەیه و تـاوەکو ئێسـتا چارەسـەرێکی شـیاو بـۆ ئەم دۆزە مەحاڵ بووە.

**کێشە و دۆزە سەرەکییەکان**

**یاسـای چـواریەکە هـۆ و ئـامرازێکی دەروونـی یـەکجار گەورەیـە لـە گفتوگۆکردنـدا. هەسـتی ڕوونیـی مـەزنت پێدەدات. بە زانینی کێشە و دۆزە سـەرەکییەکانی خـۆت و لایـەنی بەرامبـەرت هەمیشـە دەتوانیـت لێکتێگەیشـتنی دوولایەنە بدۆزیتەوە و کـە تێیـدا هـەردوو لایـەن گـرنگترین ئـەو شـتانەی دەیانـەوێت بەدەسـتی بهێـنن لـە گفتوگۆکردنەکـەدا. لەپاشـان دەتوانیـت گفتووگـۆ لەسـەر کێشە بچوك و لاوەکییەکانی دیکە بکەن.**

**کۆتـا خـاڵ لەسـەر یاسـای چـواریەکە ئەوەیـە کـە کێشـە سـەرەکییەکان بـۆ هـەردوو لایـەن، ئەوانـەن لـە کۆتایـدا لەسـەری ڕێکدەکـەون. یاسـای ٢٠ لەسـەر ٨٠ لـە گفتوگۆکردنـدا پـەیڕەو دەکرێـت. کۆتـا لـە سـەدا بیسـتی گفتوگۆکردن لەسەدا هەشتای گرنگترین ئەو کێشە و دۆزانە لەخۆ دەگرێت کە پێویستە گفتوگۆی لەسەر بکرێت.**

**کۆکبە لەسەر کێشە و دۆزە مشتومڕ لەسەرنەکراوەکان**

**لەمـەوپێش باسـی گفتوگۆیـەکی خانووبـەرەم کـرد کـە ڕێککـەوتنێکی دوور و درێـژی لـەخۆ گرتبـوو. لـەم جـۆرە**

گفتوگۆیەوە تەکنیك و ڕێگا و شێوازێکی زۆر کاریگەرم بۆ دەرکەوت: پێداچوونەوە بکە بۆ تێکڕای ڕێککەوتنەکە، لە یەکەم لاپەڕەوە بۆ کۆتا لاپەڕە، وە گفتوگۆی هەموو ئەو خاڵ و مەرج و ویستانە بکە کە ڕەنگە جیاوازییەك هەبێت لە بیرورِا یاخود داخوازییەکان.

وە بۆت دەردەکەوێت کە هەردوولاتان لەسەر لەسەدا هەشتای مەرج و خاڵەکانی ڕێککەوتننامەکە ڕێکدەکەون.

وە کاتێك دێیتە سەر خاڵێك یاخود مەرجێك کە پێی ڕازی نیت ئەوا لەوکاتەدا وازی لێ بهێنە و بچۆرە سەر خاڵ و مەرجێکی دیکە کە ڕازین لەسەری. کاتێك پێداچوونەوەت بۆ تێکڕای ڕێککەوتنەکە کرد جارێکی دیکەش پێداچوونەوەی بۆ بکە و بەو دۆز و خاڵانەدا بچۆرەوە کە پێی ناڕازیت. لە پێداچوونەوەی دووەمجاردا دەست دەکەیت بە دۆزینەوەی ڕێگا و شێواز بۆ قایلبوون و چارەسەرکردنی ئەم کێشە و دۆزانە.

پاشان بۆ جاری سێیەم و ئەگەر پێویست بوو چوارەمیش پێداچوونەوە بۆ ڕێککەوتنەکە دەکەیت. لە خاڵێکی دیاریکراودا، دەگەیتە "چوار کۆتاکە"دەگەیتە ئەو

قۆناغەی کە چوار دۆز هەیە. کێشە و دۆزێکی سەرەکی کە دەبێت چارەسەربکرێت لەگەڵ سێ دۆزی دیکەی لاوەکی. ئێستا تۆ ئامادەیت تاوەکو گفتوگۆیەکی هەتەر و جددی ئەنجام بدەیت.

**مەرجەکانی دامەزراندن ( کارکردن )**

لەکاتی دانرانت بۆ کارێکی نوێ، گفتوگۆکردنت لەسەر موچە و قازانجەکان کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر ئەوەی کە چەندەت بەدەست دەکەوێت و چۆن دڵخۆش دەبیت لەو کارەتدا بۆ ماوەی چەند ساڵی داهاتوو.

زۆرێك لەخەڵکی وابیر دەکەنەوە کەهەر لەسەرەتاوە پێویستە بەرزترین موچەیان پێبدرێت. بەڵام زۆرینەی کۆمپانیاکان مەرجیان هەیە لەسەر پێدانی پارە بۆ کارێکی دیاریکراو. زۆرجار، خاوەنکارەکە ناتوانێت لەگەڵ پێشبینیکردنی تۆ بۆ موچەکەت بگونجێت. لەم کاتەدا ئاراستەکە دەگۆڕێت. گفتوگۆ دەکەیت و داوای قازانجی زیاد دەکەیت، وەك ئۆتۆمبێلی کۆمپانیا، چاودێریی تەندروستی، کاتی پشووی زیاتر، کاتی کارکردنی جێگیر وە چەند شتێکی دیکەی گرنگ.

باشترین ڕێگاچارەکان ئەوەیە کە ڕازی بیت بەو موچەیەی کە پێتدەدەن، دوای ئەوەی بۆت دەرکەوت کە خاوەنکارەکە زۆر توند و ناڕازییە. لەپاشان دەگەن بە ڕێککەوتنێك لەسەر ئەوەی کە دەبێت چی بکەیت و چی بەدەست بهێنیت تاوەکو موچەکەت بۆ زیاد بکرێت. زۆر گرنگە کە خاوەنکارەکە ڕازی بکەیت بەوەی لەدوای نەوەد ڕۆژی دیکە پێداچوونەوەیەك بۆ کارەکانت بکات. ئەگەر هاتوو لەو ماوەیەدا دەستکەوتێکی باشت هەبوو وە توانیت چەند شتێك بەدەست بهێنیت ئەوا دەبێت بڕێکی دیاریکراو بۆ موچەکەت زیاد بکات. ئەمە ستراتیژییەکی باشی گفتوگۆکردنە کاتێك کە کارێکی نوێ وەردەگریت.

# بەشی پازدەهەم
# هێزی پێشنیارکردن لە گفتوگۆکردندا

مــــرۆڤ بەشـــێوەیەکی گشـــتی کـــارتێکراوە لەلایـــەن دەوروبــەرەوە، بــەو هێــزی پێشــنیارکردنەی کــە خــەڵك و بارودۆخەکانی دەوروبەری لـە خـۆ دەگرێت. بەتـەواوی لـە سـەدا نـەوەد و پێنجـی بیرکردنـەوەکانتت، هەسـتەکانت، بڕیارەکانت کارتێکراو یاخود دەستبەسەرداگیراون لەلایـەن دەوروبەرتەوە.کاری تۆ ئەوەیە، یەکەم، زۆر ئاگـاداری ئـەو پێشنیارە کاریگەرانەی دەوروبـەرت بیـت کـە کاریگـەرییان لەسەر بیرکردنەوەی تۆ و لایەنی بەرامبـەرت هەیـە، دووەم شت ئەوەیە کە هەموو شتێك بکەیت تـا جڵـەوگیری ئەوانـە بکەیت.

با شوێن وەك نمونەیەك وەربگـرین. ئـەو جێگـا و شـوێنەی کە گفتوگۆکەی تێدا ئەنجام دەدرێت دەکرێت کاریگەریەکی یـەکجار زۆری هــەبێت لەســەر ئــەو مــەرج و خالآنــەی کــە لەســەری ڕێکدەکــەون. کاتێــك لــە نوســینگەی کەسـێکی دیکەیت وە لە دەوروروبـەرت هـەموو کەلوپـەل و دەسـتەی

کـاری لایـەنی بەرامبـەری تێدایـە، بەشـێوەیەکی خۆکارانـە هەسـت بـەخراپی دەکـەیت کـە گفتوگـۆ لـە بەرژەوەنـدیی خۆت بکەیت. لە بارێکی دەروونی ناجێگیردایت، چونکە لـە دەرەوەی ناوچـەی ئـارامیی خـۆتی، وە کەسـی بەرامبـەر بەتـــەواوی لەناوچـــەی ئارامیدایـــە و هەســـتێکی بـــاوەڕ بەخۆبونی زیاتری هەیە و هەست بـەهێزی کەسـی دەکـات، وە لێرەدا تـۆ هەسـت بـەباوەڕ بـەخۆبوون و هێـزی کەسـی کەمتر دەکەیت.

## شوێنەکە بگۆڕە

زۆر جار ئەوە دەبینین کە لە گفتوگۆ گرنگ و هەتەرەکانـدا وەك لە کۆبوونـەوەی بەڕێوبـەرەکان، لایەنـە سیاسـییەکان وە بەتایبـــەتیش ڕێککەوتنـــە ئـــاڵۆزە بازرگانیەکانـــدا، هەردوولایەن ڕازی دەبن لەسەر ئەوەی کە بچـنە شـوێنێکی دەرەوەی ناوچـەی یـەکتری و لـە شـوێنێکی بێلایەنـدا بـن. ئەمە وا دەکات هەردوولایەن لـە هـەمان ئاسـتدا بـن لـەڕوی کاریگەرییەکانی دەوروبەرەوە.

هەندێك جار پێشنیارکردنی ئەوەی گفتوگۆ لەسەر دۆزێك بکرێت لەسەر مێزی قاوەخواردنەوە یاخود نانخواردن لە شوێنێکی گشتی زۆر باشترە وەك لەوەی گفتوگۆی بابەتێکی هەتەر و گرنگ بکەیت لە نوسینگە و شوێنی کاری کەسی بەرامبەر تێدا لە ئارامی و لایەنی باشی دەروونی دا بێت و تۆش نائارام بیت.

**هێزی کەسایەتی**

کەسایەتی، توخمێکی پێشنیارانەی دیکەیە. باشترین جۆری کەسایەتی لە گفتوگۆدا کەسایەتییەکی هاوخەم و نەرمونیانە. هەتا زیاتر هەست بە ئاسودەیی بکەیت لەگەڵ ئەوکەسەدا زیاتر کراوە و هەستیار دەبیت سەبارەت بە داخوازییەکانی ئەو کەسە. وە پێچەوانەکەشی ڕاستە. هەتاوەکو زیاتر هاوڕێ و ڕووخۆش بیت، ئەگەری بەدەست هێنانی ڕێکەوتنێکی باشتر و سەرکەوتووت زیاتر دەبێت وەك لەوەی کەسێکی خۆپارێز یاخود ڕەق و بێ هەست بیت.

لێکتێگەشتن و هاوخەمی بەکوالیتییەکی پلە یەکی سایکۆلۆژی فرۆشیارە ئاست بەرزەکان پێناسەکراوە. ئەو کەسانەی کە باشتر بێت لە یارمەتیدانی ئەوانی تردا، دێنە نێو مامەڵەی بازرگانییەوە وادیارە کە ئاستێکی بەرزی لێکتێگەشتن و هاوخەمییان هەیە. ویستراو و ڕێزلێگیراون لەلایەن کەسانی دیکەوە و لایەنی بەرامبەر هەست بەئارامی دەکات کاتێك مامەڵەی لەگەڵ دەکەن.

## شوێن و زمانی جەستە

یەکێکی دیکە لە توخمەکان شوێن و زمانی جەستەیە. بەپێی وتەی ئەلبێرت میهرابین، لەسەدا پەنجا و پێنجی گفتوگۆکردنت لەگەڵ کەسی بەرامبەر پێکهاتووە لە زمانی جەستە– ئەو شێوەیەی کە دەوەستیت و جوڵەی جەستەی پێ دەکەیت بەرامبەر کەسانی دیکە.

یاسای سەرەکی کە پەیوەستە بە وەستانی جەستەییەوە ئەوەیە کە خۆت بەدور بخەیت لە دانیشتن لەسەر مێز بەرامبەر ئەو کەسەی کە گفتوگۆی لەگەڵ دەکەیت. کاتێك کە ڕاستەوخۆ لەسەر مێزێك بەرامبەر کەسی دیکە

دادەنیشیت ئـەوا بەشـێوەیەکی خۆکارانـە خـۆت دەخەیتـە بـارێکی بەرهەڵسـتکارانەوە. پـەیامی نەسـتت ئەوەیـە کـە هـەردوولاتان وەك دوژمـنن وە دەتانـەوێت بـەجۆرێك لـە جۆرەکان شـەڕ بکـەن. بەدرێـژای چـەند سـالێك ئـەوەم بـۆ دەرکەوت کە دانیشتن بەدەوری مێزێکدا یاخود دانیشتن لە تەنیشتی یەکتر باشترە بۆ بەدەستهێنانی ڕێکەوتنێك، وەك لەوەی لە بارێکی دژ بەرامبەریەکدا بن.

**دەستەکانت پەیام دەگەیەنن**

هۆکـارێکی دیکـەی گفتوگـۆکردن یـاخود کاریگەرییـە پێشنیارەکان لـە گفتوگۆکردنـدا کـە پەیوەسـتە بـە زمـانی جەسـتەوە، ئـەو شـێوازەیە کـە دەسـت و باسـکی پـێ دەجوڵێنیـت، وە ئـەو شـێوازەی کـە جەسـتەتی پـێ دەجوڵێنیـت. بـۆ نمونـە کاتێـك قۆڵـەکانت لەیـەکتر دەپێچـیتەوە ئـەوە دەگەیـەنێت کـە تـۆ لـە دەمـەقاڵێ و گفتوگـۆکردنی کەسـی بەرامبـەر دەکشـێیتەوە(دوور دەکەویتەوە). وە ئەوە نیشان دەدەیت کە ناڕازیت بـەوەی کەسی بەرامبەر دەیڵێت.

یەکێك لە ئاماژە جیهانییەکان بۆ کراوەیی و ڕاستگۆی و دڵسۆزی "دەستی کراوەیە" کاتێك دادەنیشیت و باسکەکانت لێك نەئاڵاندوە، دەستەکانت لە دەرەوەن. لەپی دەست دیارە ئەوا پێشنیار بۆئەوە دەکەیت کە ئەوەی دەیڵێیت، گونجاو، پەسەندکراو، دۆستانەیە و هیچ هەڕەشە و ترسێکی بۆ بەرامبەر نییە.

توخمە پێشنیارکارەکانی دیکە

١. ئاسودەیی. زیاتر حەز بە گفتوگۆکردنی مامەڵەیەکی باشتر دەکەیت ئەگەر دەوروبەرت— کەلو پەلەکان، ڕوناکییەکان، پلەی گەرمی ژوورەکە لە ئاستێکدا بن کە ئاسودەییت پێ ببەخشن.

٢. حەسانە و پشودان. هەمیشە حەز بە گفتوگۆ دەکەیت ئەگەر بەرلەوەی دەست بە گفتوگۆ بکەیت بەتەواوی پشووت دابێت و حەسابێتیتەوە.

٣. برسێتی، خواردن، خواردنەوە. کاتێك بەرلە گفتوگۆکردن نانی باش دەخۆیت. ئەوا مێشکت دەتوانێت بەباشترین شێوە کار بکات. لەگەڵ خواردنەوەی باشیشدا. باشترین خۆراکەکان بۆ مێشك

ئەوانەن کە پرۆتینی زۆریان تێدایە. بەدووربە لە نان و گۆشتی بەراز و سۆسەج و گۆشتی کولاو، هەموو ئەم جۆرانە واتلێدەکەن خەوالوو بیت بەدرێژایی ڕۆژەکە. وە هەروەها گفتوگۆکردن لەدوای خواردنی ژەمێک لەگەڵ لایەنی بەرامبەردا، ڕێگە شێوازێکی باش و بەهێزە. کاتێک لەگەڵ کەسی بەرامبەردا ژەمێک دەخۆیت هەست بەباشی دەکەیت و گەرموگوڕتر دەبیت لەگەڵی. هەمیشە زیاتر حەز بەو کەسانە دەکەین کە شتیان لەگەڵ بەش دەکەین.

٤. هەڵسوکەوتت. کۆتا توخمی هێزی پێشنیارکردن لەگفتوگۆدا هەڵسوکەوتتە. لە گفتوگۆدا هەڵسوکەوتی ئەرێنی_ کە پێناسەکراوە ئاسودەییەکی گشتی و هەستی گەشبینی – زۆر باشتر و کاریگەرترە لە هەڵسوکەوتێکی نەرێنی لە گەیشتن بەو دەرئەنجامەی کە دەتەوێت.

## بەشی شازدەهەم
## قایلکردن لەڕێگەی گۆڕینەوەوە

ڕۆبــرت ســیلدینی لــە کتێبــی "کاریگەرییــەکان دا" ئــەو هۆکارانەی دیاریکردووە کە کاریگەرییەکی گـەورەیان هەیـە لەســەر شــێوازی بیرکردنــەوە و وەڵامدانــەوەی خــەڵکی بەرامبــەر بــە تــۆ. بــەگوێرەی خەمڵاندنــەکانی، بــەهێزترین کاریگەرییــەکان، هێــزی گۆڕینەوەیــە(پێــدان و وەرگــرتن). لێکۆڵینــەوەکان دەریانخســتوە کــە گۆڕینــەوە(پێــدان و وەرگرتن)ە ، بەهێزترین شێوازە بۆ گەیشتن بە ڕێکـەوتن و سازان.

مرۆڤەکان مەیلیان لە دادپــەروەری وگونجاندنــە لــە میانــەی کارکردن و بەرکەوتنیان لەگەڵ کەسانی دیکەدا. ئەمـە واتـا کاتێك تۆ کارێك یاخود شتێك بـۆ مـن دەکـەیت، وا هەسـت دەکەم لەبەرامبەردا من دەبێت شتێك بەهەمان بەها یـاخود زیاترت بۆ بکەمەوە. ئەمەش شتێکی ئاسـایی و سروشـتیی مرۆڤـە. ئەمـە بنچـینەی شارسـتانیەتە و بناغـەی یاسـایی

ڕێکەوتنامەکانە، کەوا دەکات هەموو بازرگانییەك شیاو بێت و ئەنجام بدرێت.

**کار بۆ کەسانی دیکە ئەنجام بدە**

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کاتێك لە گفتوگۆکردندا کارێکی جوان و شیاو بۆ بەرامبەرەکەت دەکەیت، ئەگەر هەڵگرتنی کورسییەك یاخود پێدانی کوپە چا یان قاوەیەکیش بێت، ئەوا هەست و خواستی گۆڕینەوەیان لەلا دروست دەکەیت ـ وایان لێدێت چاکەکەت بدەنەوە بەشێوەیەکی زۆر باش و ئەرێنییانە. وە کاتێك پرسیاریان لێدەکەیت سەبارەت بە ژیانیان، کارەکەیان، و خانەوادەکەیان وە بەپەرۆشییەوە گوێیان بۆ دەگریت لەکاتی قسەکردندا، ئەوا وایان لێدەکەیت کە هەست بە دڵخۆشی بکەن دەربارەی خۆیان.

**شێوازی سوقرات بەکاربهێنە**

بۆ پتەوکردنی گۆڕینەوە لە گفتوگۆدا شێوازی سوقراتی بەکاربهێنە. سوقرات دەڵێت "سەرەتا، بڕیار لەسەر هەموو ئەو بوارانە بدە کە ڕازییت لەسەریان، پێش ئەوەی بچیتە سەر ئەو بوارو مەرجانەی کە بیروڕای جیاوازیان تیایدا هەیە". هەروەك لە بەشی پێشتردا باسمان کرد،

پێشنیاری ئەوەم بۆ کردن کە وتووێژ و گفتوگۆکان بە پێداچونەوەی هەموو مەرج و خاڵەکان دەستپێبکەن یەك لەدوای یەك. هەمیشە ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆر لە خاڵ و مەرج هەن کە تۆ و لایەنی دیکەش لەسەری کۆکن و هەردوولاتان ڕازین پێی. کاتێك هەردولا گفتوگۆ دەکەن و ڕازی دەبن لەسەر زۆرینەی کێشە و بابەتەکان، ئەوا ویست و خواستی ئەرێنی بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن بونیاد دەنێیت.

**خۆت لە کێشە و دۆزە لاوەکییەکان دووربخەرەوە**

هەرکاتێك لە گفتوگۆکردندا لەمیانەی پێداچونەوەی دۆز و بابەتەکاندا کە دەگەیتە خاڵێك کەسی بەرامبەر تیایدا ناڕازییە یاخود بەرهەڵستی دەکات، ئەوا بەخێرای بڵێ "با بێینەوە سەر ئەوە".

هەتا خێراتر بەسەر کێشەیەکی مشتومڕ هەڵگردا بڕۆیت، کەمتر توشی نەویستن و بەرهەڵستی دەبیتەوە لەلایەن کەسی بەرامبەرەوە. هەتا لەسەرەتادا لەسەر خاڵی زیاتر ڕێکبکەویت، ئەوا زۆر ئاسانتر دەبێت کەسی بەرامبەر لە دواتردا لەسەر خاڵەکانی دیکە ڕێکبکەویت. بە ئاسانکردن

و خۆشـکردنی مشـتومڕەکە لـە سـەرەتاوە، ئـەوا وادەکـات لایــەنی بەرامبــەریش هــاوڕا بێــت و بیــەوێت بەئاســانی و نەرمونیانی بگەنە ڕێکەوتن. لەسەرەتای گفتوگۆکردنەکەوە بۆ هەموو ئـەو ڕێگایانـە بگـەڕێ کـە گونجـاوە و دەتوانیـت لەگەڵ کەسی بەرامبەردا ڕازی بیت. بـەم شـێوەیە ئـارەزوو ئامادەگییــەك لــە کەســی بەرامبــەردا دروســت دەبێــت و ئەویش لەگەڵ تۆ هاوڕا و قایل دەبێت.

**بەهێواشی و لەسەرخۆییەوە قایل بە**

تەکنیکێکی دیکە کە لـە گفتوگۆکردنـدا دەتوانیـت بـەکاری بهێنیـت، لەکاتێکـدا کـە ئەگـەر هـیچ کێشـەیەکیش نـەبێت خاڵێکی دیاریکراو و مەرجەکانیشدا، ئەوەیە کە بەهێواشـی و لەسەرخۆی و بەوریای و کەمێك نابەدڵییەوە ڕازی بیـت و قایلبوونی خۆت نیشـان بـدەیت. کاتێـك بـەخێرایی و بـەبێ دوودڵی لەسەر شتێك ڕازی دەبیت، ئەوا لایەنی بەرامبـەر وا هەست دەکـات کـە ئـەم بابەتـە گرنگییـەکی ئـەوتۆی نییـە بــەلای تــۆوە. بــەڵام کاتێــك بەگرنگییــەوە لــە بابەتەکــە دەڕوانیــت ئــەوا وادەکــەیت کەســەکەی دیکــەش گرنگــی پێدەربێت لە بەرامبەردا.

### دەست لەسەر دوگمەی دادپەروەری دابنێ

یەکێك لـە گـرنگترین ڕێسـاکانی بەسـۆزیی لـە پەیوەنـدی و گفتوگۆکانی مرۆڤدا، ڕێسای دادپەروەرییـە بەبـەردەوامی و هەتا دەتوانیت وشەی دادپـەروەریی و ڕەوایـی بەکاربهێنـە لەبەرئەوەی ئەم وشەیە خواستی ئاڵوگۆڕ لـە هـزری لایـەنی بەرامبەرتـدا بەشـێوەیەکی ئـەرێنی زیـاد دەکـات. هەنـدێ ڕستەی وەك ئەمانە بڵێ، "من پێموایـە کـە دادپـەروەرترین شت لێرەدا ئەنجامی بدەین ئەمـەبێت" یـاخود، " بەڕاسـتی ئەمـە هـیچ دادپەروەرانـە نییـە بـۆ مـن بـەم شـێوەیە." وە یاخود، " دەمەوێت بـۆ هـەردوولامان دادپـەروەر بم." هـیچ کەسێك هـەرگیز دەمـەقاڵێت لەگـەڵ ناکـات کاتێـك ویسـتی دادپەروەرییت هەبێت.

### لەبەرامبەردا داوای شتێك بکە

کاتێك دوودڵی(نابەدڵییت) سەبارەت بە هەندێك خاڵی بچوك و لاوەکی، ئەوا لەپاشان دەتوانیت بڵێیـت،"سـەیرکەن، بـە داواکارییەکانی ئێوە ڕازیبووین لە هەریەك لەم بوارانەدا. تا ئێسـتا لەسـەر هـەموو شـتەکان ڕێککـەوتووین، وە هـەموو

ئــەوەی ئێمــە داوای دەکــەین ئەوەیــە کــە کــەمێك، لــەو بوارانەشدا بە ئێمە بدەن"_ کە بە دڵنیاییــەوە بــۆ ئێــوەش زۆر گرنگە.

## نرخ و مەرجەکان جیاوازن

لەبیرت بێت کە نرخ و مەرجەکان پێکهاتەی زۆر جیاوازن لە گفتوگۆکردنــدا. دەکرێــت نرخێکــی زیــاتر لــەوە بــدەیت کــە خــۆت دەتــەوێت تــاوەکو بتوانیــت ئــەو مەرجانــە بەدەســت بهێنیــت کــە زیــاتر بــۆت گونجــاون. دەتوانیــت بەلایــەنی بەرامبــەر بڵێیــت کــە نرخێکــی زیــاتر دەدەیــت ئەگــەر لەبەرامبەردا ئەوانیش هەل و مەرجی باشترت پێبدەن.

هەندێك لە هاوڕێکانم گفتوگۆی مـوڵکێکی ملیـۆن دۆلارییـان کرد بوو. موڵکەکە خـۆی، بـەپێی نرخـی بـازاڕی، زیـاتر لـە ٦٠٠٠٠٠ دۆلار نــەبوو. بــەلاَم فرۆشــیارەکان داوای ملیۆنێــك دۆلاریان دەکرد لەبەرئـەوەی هاوڕێیـەکیان هـەر ئـەو ساڵە موڵکــەکانی بەهــەمان ڕووبــەر و نرخــی ملیۆنێــك دۆلار فرۆشــتبوو. بــەلاَم بەدڵنیاییــەوە ئــەو زەوییــەی تــر هەڵکەوتەکـەی زۆر باشـتربوو، گونجـاوتر بـوو بـۆ پـرۆژە و

وەبـەرهێنان وە بەبـەهاتر بـوو. بـەڵام خـاوەن موڵکـەکان سـووربون لەسـەر ئـەوەی ئەگـەر ملیۆنێـك دۆلاریـان پێنەدەیت ئەوا زەوییەکان نافرۆشن.

لەکۆتایدا هاوڕێکانم ڕازیبوون بەوەی ئەو نرخە بدەن، بەڵام لە کاتێکدا کـە فرۆشـیارەکان چـەند مـەرجێکیان پەسـەند بکەن. مەرجەکانیش ئـەوەبوون کـە بـەماوەی بیسـت ساڵ ملیۆنە دۆلارەکە دەدەن، ساڵی ٥٠٠٠٠ بەبێ هێچ زیادەیـەك کاتێك زەوییەکانیان دابەشـکرد بەسـەر چـەند یەکەیەکدا و هـەموو یەکەکانیشـیان فرۆشـت و پارەکـەیان وەرگـرت لـە کڕیارەکـان ئـەمانیش پـارەی فرۆشـیارەکان دەدەن.

لەبەرئەوەی نرخـە ملیـۆن دۆلارییەکـە گـرنگترین شـت بـوو بەلای خـاوەن زەوییەکانـەوە، وە مەرجـەکانیش گـرنگترین بـوون بـۆ هاوڕێکـانم، بـەم هۆیـەوە توانیـان ڕێککـەوتنێکی قایلکەرانە ئەنجام بدەن کە تیایدا هـەردوولا گـرنکترین ئـەو شتانە بەدەست بهێـنن کـە دەیانویست. زۆربـەی کـات کـە دەچـیە گفتوگۆیەکـەوە، لەسـەرەتادا وادەردەکـەوێت کـە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ ڕازیبوون و ڕێککـەوتن. بـەڵام کاتێـك تیشـکۆی سـەرنجدانت لـە نرخـەوە دەگۆڕیـت بـۆ مـەرج و

خاڵی فرۆشتنەکە، ئەوا هەمیشە ڕێککەوتنێکی دوولا بـراوە بەدەسـت دەهێنیـت کـە تیایـدا هەردوولایـەن دڵخۆشـن. هەموو ئەو ڕێکەوتنە بازرگانییە گرنگانـەی کـە لـە مێـژوودا ئەنجامدراون بەم شێوەیە بوون.

# بەشی حەڤدەهەم
# قایلکردن بە بەڵگەی کۆمەڵایەتی

یەکیك لەبە هێزترین کاریگەرییەکانی لەسەر بیرکردنەوە ئەوەیە کە کەسانی دیکە "وەك من" چییان ئەنجامداوە لە هەمان دۆخی مندا. زیاد لە پێویست کارتێکراوین بە ڕەفتار و بە هەڵسوکەوتی کەسانی دیکە ئەوانەی کە دەیانناسین و کارلێکیان لەگەڵ دەکەین . لەبیرمە ڕۆژێکیان خانمە گۆڤارفرۆشێك لە دەرگای ماڵەکەمانیدا و هاتە ماڵەکەم. کەسێکی زۆر ڕووخۆش و دۆستانە بوو. خۆی ناساند و لەپاشان وتی "لەگەڵ دراوسێکانیشتان قسەم کردوە، وە هەرکەسێك کە قسەی لەگەڵ دەکەم پشتگیریم دەکات بە شەش گۆڤار کە من پێشەکەشی دەکەم. وە من وا بیردەکەمەوە کە ئێوەش پێتان خۆش بێت سەیرێکی لیستەکە بکەن و بەژداربن."

بەرلەوەی کە دەرفەتی بیرکردنەوەمان هەبێت سەبارەت بەوە، ئێمەش پشتگیری شەش گۆڤارمان کرد. گومانم هەبوو لەوەی کە گۆڤارەکانیش بخوێنینەوە. بەلآم ئەگەر

**هەموو دراوسێکان شەش دانە لەو گۆڤارانە بکڕن ئیتر چۆن ئێمە دەتوانین ڕەتی بکەینەوە؟**

**کەسانی وەك ئێمە**

**ئێمە بەشێوەیەکی بەرچاو کارتێکراوین بەوەی کەسانی دیکە ئەنجامی دەدەن یاخود دەیکڕین و دەیفرۆشن، بەتایبەتیش ئەو کەسانەی کەوا هەستەکەین هاوشێوەی ئێمەن لە ویستەکانیان، ئیشەکانیان، داهاتەکەیان، یاخود تەنانەت لەڕووی ئاین و لایەنگیریی بۆ لایەنیکی سیاسی. دەکرێت گفتوگۆ لەگەڵ کەسێك بکەیت وە ئەوکەسە بەشێوەیەکی نەرێنی دەربکەوێت یاخود ئارەزووی گفتوگۆکردن نەکات لەگەڵت. لەپاشان دەڵێت، باشە، هۆکاری ئەوەی کە قسەت لەگەڵ دەکەم ئەوەیە کە هەفتەی ڕابردوو براکەشت دووپارچە لەمانەی کڕی. لەپڕ، زۆرجار کەسی بەرامبەر یەکسەر دەیەوێت ئەویش بیکڕێت، تەنها بەزانینی ئەوەی کە کەسێکی ئەم دەیەوێت و خۆشی دەوێت و ڕێزی دەگرێت هەمان کڕین و فرۆشتنی کردووە یاخود هەمان ڕێکەوتنی ئەنجامداوە.**

بەڵگە و سەلمێندراوە کۆمەڵایەتییەکان کۆ بکەرەوە
ڕاستییەکان، بەڵگەکان، ناوەکان، ژمارەکان و ئامارەکان لەو کەسانەی کە دەیانناسیت بۆ لایەنی بەرامبەر بەکاربهێنە. بەڵگەیی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنیت، وە ئاماژە بە ئەوانی دیکە دەکەیت کە هەمان بڕیاریانداوە، ئەمە دەریدەخات کە ئەو مەرج و داخوازییانەی تۆ داوای دەکەیت گونجاو وماقولن. بۆ نمونە، کاتێک ئۆتۆمبێلێک دەکڕیت، فرۆشیارەکە هەمیشە دەڵێت "خەڵکی وەك تۆ لە بازرگانیدا هەمیشە بژاردەی GPS هەڵدەبژێرن کاتێک ئەم ئۆتۆمبیلە دەکڕن". ئەژنۆکانت لاواز دەبن کاتێک ئەو کەسەی دیکە دەڵێت "خەڵکی وەك تۆ"لەپێشتریش بریاری ئەم کڕینەیان داوە و ئەم ڕێکەوتنەیان ئەنجامداوە. دەستبەجێ کورسییەکەت لەژێر دەردەهێنێت و بەرهەڵستی هەست و سۆزت نزم دەکاتەوە. هەمیشە بڵێ "کەسانی هەمان شێوە لە بارودۆخی هاوشێوەدا" کە بڕیاری هاوشێوەیان داوە، کاتێک بەبەردەوامی کەسانی دیکە ناوزەند دەکەیت کە بەڵێننامەی هاوشێوەیان

ئەنجامداوە، ئـەوا گونجـاوی و دادپــەروەری ئـەوە دەخاتــە ڕوو کە دەتەوێت وە قایلکەرێکی زۆر کاریگەر و بەهێزە.

**خەڵکی لە هەمان کارو پیشەدا**

بـا بڵـێین سـەرقاڵی گفتوگـۆکردنی لەگـەڵ دکتۆرێکـدا بـۆ کڕینـی کۆمپیوتـەرێکی نـوێ و سیسـتمێکی کـارکردن بـۆ ئەنجامدانی ڕاهێنانەکانی. کاتێك کـە دەڵێیـت زۆر دکتـۆری دیکەش لە هەمان بواری ئـەودا ئـەم سیسـتمەیان کڕیـووە، ئەوا هیچ بەرهەڵسـتییەکی بـۆ کڕینـی نامێنێـت. هـەرکاتێك لەگەڵ لایەنی بەرامبەر گفتوگۆی خاڵ و مەرجێکت کرد کـە تیایدا ناڕازی بوون، ئەوا نمونەی خەڵکی تریان بۆ بهێنــەوە کە هاوشێوەی ئەوکەسەن، سـەرەتا ئـەوانیش بەرهەڵسـتی ئەو مەجەی کردووە.بەڵام لەکۆتایدا پێی ڕازی بوون. ئەمـە زۆر ئاسانتر دەبێـت بۆئـەوەی کەسـێك بـاوەڕ پـێ بهێنێـت کاتێــك نمونـــەی کەســـانی دیکـــەی وەك ئـــەوانیان بـــۆ دەهێنێتەوە.

**بە هەموو جۆرێك بەڵگە بەکاربهێنە**

یەکێك لە بەهێزترین نمایشەکان ئەوەیە کاتێك بەڵگەیـەکی نوسراو، نامەیەك یاخود لیسـتی ئـەو کەسـانە دەخەیتـەڕوو

کەڕێکەوتنیان ئەنجامداوە بە هەمان ئەم خاڵ ومەرجانەی کە تۆ پێشنیارت کردووە. ماوەیەك لەمەو پێش، گفتوگۆی ڕێککەوتننامەیەکم کرد لەگەڵ بانقێکی سەرەکیدا. بەهۆی نرخەکەوە بڕیارەکە نێردرا بۆ سەرۆکی بانقەکە. کە پاشان لە نامەیەکدا وەڵامی نوسی بوو کە حەز بەم ڕێککەوتنە ناکات، بەڵام ئەگەر بێت و من ناوی ئەو بانقانەی پێ بڵێم کە کارم بۆ کردوون ئەوا ڕەنگە بڕیارەکەی بگۆڕێت. لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا لیستێکم بۆ دروستکرد کە ناوی دە بانقی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی تێدابوو کە لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا کارم لەگەڵ کردبوون. تەنانەت ناو و ژمارەی تەلەفۆنی ئەو کەسانەشم پێدا کە لەو بانقانەدا پەیوەندیم لەگەڵیان هەبووە. بەهەرحاڵ، لەماوەی تەنها پێنج خولەکدا بە خوێندنەوەی لیستەکە، دەستبەجێ ڕازیبوو وە ڕێککەوتنامەکەی واژۆکرد. تەنانەت پەیوەندی بە هیچ کەسێکیشەوە نەکردووە داوای هیچ سەلماندنێکیشی لێم نەکرد تەنها ویستی ئەوە بزانێت کە ئەوانی دیکەش "وەك ئەم" هەمان ئەو خزمەتگوزارییانەیان بەکارهێناوە کە من پێشکەشی

بانقەکـــەیم کردبـــوو. بـــە چـــوونت بـــۆ گفتوگۆکردنێـــك و ئامادەکارییت بۆئەوەی ناو ئەو کەس و دامەزراوانـە بـدەیت کە پێشتر بڕیاری کڕین و فرۆشتنیان داوە لەژێر ئەو هەل و مەرجانـــەدا، ئـــەوا ئەگـــەری دەســـتکەوتن و ئەنجامـــدانی ڕێکەوتنێکی باشتر دەبێت. ئەمە بـەهێزترین هۆکـارە بـۆ سەرکەوتنی گفتوگۆیەك کە تائێستا زانراوە.

# بەشی هەژدەهەم
# تاكتیكەكانی گفتوگۆكردن لەسەر نرخ

لە بەشی سێهەمدا باسمان لە جۆرەكانی گفتوگۆكردن كرد گفتوگـۆی كورتخایـەن، گفتوگـۆی یـەكجاری، و گفتوگـۆی بازرگانیی درێژخایەن. لە گفتوگۆی كورتخایەندا، كاری تـۆ ئەوەبوو باشـترین نـرخ بەدەسـت بهێنیـت لـەو كاتـەدا، بـێ گوێدانــە ئــەوەی كــە ئایــا جــارێكی دیكــە ئــەو كەســە دەبینیتەوە یاخود كاری لەگەڵ دەكەیتەوە. زنجیرەیەك لە تاكتیكــەكانی گفتوگــۆكردنی نــرخ هــەن كــە دەتوانیــت بەكاریان بهێنیت بۆئەوەی نرخی باشتر یـاخود ڕێككـەوتنی باشــتر بەدەســت بهێنیــت لــە كــڕین یــاخود فرۆشــتنی یەكجاریــدا. خۆشــبەختانە ئــەم تاكتیكانــە دەكرێــت لــە گفتوگۆكردنی درێژخایەنیشدا بەكاربهێندرێت لە كاتێكدا كە لەگەڵ هەمان لایەندا ڕێكەوتن بكەیتەوە ساڵ دوای ساڵ.

تاكتیكی یەكەم: ڕاچڵەكان

كێشــە نییــە كــە لایــەنی بەرامبــەر چ نرخێـك داوا دەكـات، ڕاچڵەكێ وەك ئەوەی شـتێكی هیـوابڕت بیسـتبێت. لەسـەر

دەم و چاوت شـێوەیەکی دڵشـکاو خـەمبار پیشـان بـدە.
چـاوەکانت سـەرە و خـوار پێبکـە وەك ئـەوەی ئـازارێکی
زۆرت هـەبێت. شـتێك بڵـێ، وەك " چـی، ئـەوە پارەیـەکی
یـەکجار زۆرە ! ". هەنـدێك جـار ئـەم ڕاچـڵەکانە وادەکـات
لایـەنی بەرامبـەر بـەخێرایی نرخەکـە بگۆڕێـت. وە ئەگـەر
ڕاچڵەکانی یەکـەم بووەهـۆی ئـەوەی نرخـی کـەمتر بـدەیت
کاتێـك شـتێك دەکڕیـت وە نرخـی زیـاترت پێبـدەن کاتێـك
شـتێك دەفرۆشـیت، ئـەوا ئامادەبـە بـۆ بـەکارهێنانی ئـەم
ڕاچڵەکانە دووبارە و دووبارە بەدرێژایی گفتوگۆکردنەکە.

**تاکتیکی دووەم: پرسیار بکە (پرسیار کردن)**

بپرسە " ئایا ئەمە باشـترین شـتە کـە بیکـەیت ؟ نـاتوانی
باشتر لەوە بکەیت؟"

کاتێــك لەنرخەکــە دەپرســێت و کەســی بەرامبــەر وەڵام
دەداتــەوە، بوەســتە و بەسەرســوڕماوی یــاخود تەنانــەت
بەداخرۆپاوییەوە بڵێ ، ئەمە باشترین شتە کـە بیکـەیت لـە
پاشاندا تەواو بەبێـدەنگی بمێنـەرەوە ئەگـەر بتـوانی بەمـە
کەسـی بەرامبـەر قایـل بکـەیت، ئـەوا دەسـتبەجێ کەسـی
بەرامبەر نرخەکە دادەبەزێنێت بـۆ فرۆشـتن یـاخود بـەرزی

دەکاتەوە بۆ کڕین. ئەگەر کەسەکە لەوەلآمی پرسیاری" ئایا ئەمە باشترین شتە کە بتوانیت بیکەیت" دا نرخەکەی دابەزاند، ئەوا لە پاشاندا بلێ" ئایا ئەمە باشترین و باشترینە کە بتوانیت بیکەیت؟"بەردەوامبە لەوەی داوای نرخی کەمتر و باشترین مەرج بکەیت . بەردەوام و دووبارە بپرسە، ناتوانیت لەوە باشتر بکەیت؟"

دەتوانیت بپرست ، باشترین شتێك کە بتوانیت بیکەیت چی دەبێت ئەگەر من ئەمڕۆ بڕیار بدەم ؟" ئەمە خەسڵەتێکی بەپەلە بوون دروست دەکات و وادەکات فرۆشیارەکە ترسی لەدەستدانی مامەڵەکەی هەبێت. هەندێك کات دەتوانی ئەم پرسیارە بکەیت " ئایا دەڵێیت کە هەرگیز ئەم شتەت بە کەمتر لەو نرخە نەفرۆشتووە بە کەسێکی دیکە؟ کەسی دیکە هەرگیز لەو نرخە کەمتر نەیکڕیووە ؟" کاتێك ڕاستەوخۆ ئەم پرسیارە دەکەیت کەسی بەرامبەر ناچار دەبێت کە ڕاستییەکەی بلێت کە ئایا بەکەمتر لەو نرخە فرۆشتوویەتی یاخود نا.

**بەنرخی یەکەمی شتەکان بەدەست بهێنە**

لــە کــڕینی شــتێکی تاکــدا وەك کەلوپــەلی نــاو مــاڵ ، ئامێرەکـان، یـاخود کەلوپـەلی باخچـە و پـاوان، دەتوانیـت بپرسـیت " ئایـا پێشـتر داشـکاندنتان نـەکردبوو بـۆ ئـەم بابەتـە؟" سـاڵانە دامـەزراوەکان داشـکاندن دەکـەن بـۆ زۆرینــەی کەلوپەلــەکانیان. وە کاتێـك دەڵێـت لـە بـەهاردا داشکاندمان بۆ ئەم بابەتانە کردبوو، دواتر دەتوانێت بڵێـت "زۆر باشە من ئەوکاتە نـەمتوانی ئـەو بابەتـە بکـڕم، بـەڵام ئێستا دەمەوێت بەهەمان نرخـی ئـەو کـات بکـڕم. هەنـدێك جار بەتەنها پێدانی هۆکارێکی باش بە فرۆشیارەکە تاوەکو بــەنرخێکی گونجــاوتر پێــت بفرۆشــن کاریگــەری دەبێــت لەسەریان و وایان لێدەکەیت کە نرخەکەی دابەزێنێت بۆت.

**تاکتیکی سێهەم: دووپاتکردنەوە و جەخت لێکردنەوە**

بۆ هەر شتێك هـەر نرخێکیـان پێوتیـت، دەسـتبەجێ بڵـێ "دەتوانم لە شوێنێکی دیکە بە هەرزانتر دەستم بکـەوێت" هەر کاتێك بە فرۆشیارەکەت وت کـە دەتـوانم بـە نرخیکـی هــەرزانتر بیکــڕم لــە یــەکیك لــە پێشــبڕکێکارەکان ئــەوا دەســتبەجێ دەســتدەکات بــە کەمکردنــەوەی نرخەکــە.

دووپاتکردنەوەی ئەوەی کە " دەتوانم لە شوێنپکی دیکە بە هەرزانتر بیکڕم" هەمیشە دەبێتە هۆی ئەوەی فرۆشیارەکە نرخەکەت بۆ کەمبکاتەوە چونکە وا هەست دەکات دەچێت لە شوێنێکی دیکە دەیکڕێت. بەڵام لەبیرت بێت هەمیشە کەسێکی نەرمونیان و ڕووخۆش بێت تەنانەت لەم جۆرە گفتوگۆکردنەشدا، کاتێك بەڕووخۆشییەوە داوا دەکەیت، ئەوا زۆر ئاسانتر دەبێت بۆ لایەنی بەرامبەر کە نرخەکەت بۆ کەمبکاتەوە وەك لەوەی بەناخۆشییەوە داوا بکەیت.

**تاکتیکی چوارەم: لە نرخ کەمکردنەوە**

کاتێك کەسێك داوای ١٠٠ دۆلار دەکات ، تۆ دەستبەجێ لە نرخەکە کەم بکەرەوە و بڵێ" هەر ئێستا ٥٠ دۆلاری کاشت پێدەدەم ". هەرکاتیك بەخێرایی وشەی کاش بەکاردەهێنیت ئەوا بەرهەڵستییەکانی لایەنی بەرامبەر بەخێرای نامێنێت. ئەمانە هۆکارن کە بۆچی پێشکەشکردنی ڕێککەوتنێك کە پارەدانەکە تێدا بە کاش بێت وا دەکات خەڵکی زیاتر کراوە و دڵخۆشبن بەوەی

مامەڵە و بازرگانییت لەگەڵ بکەن. وە سێ لە دیارترین ئـەو هۆکارانەش ئەمانەن.

١- نرخی هەژمارەکان کەم دەکاتەوە.

٢- پێویستی بە کارتی متمانە و ئابونەی بازرگانی نییە.

٣- هەستکردن بە ڕازیبوونی دەستبەجێ.

بابڵێین تۆ تەنها ٥٠ دۆلار دەدەیت بـە شـتێکی ١٠٠ دۆلاری وە فرۆشیارەکە دەڵێت بە ٦٠ دۆلار بۆت دادەنـێم. زۆرجـار بۆت دەردەکەوێت کە ئەگەر ئەو نرخەی داتبەزاندووە بـۆی زۆر پێکەنیناویش بێت هێشـتا فرۆشـیارەکە ئارەزوومەنـدە کە بە نرخێکی لەوە کەمتریش پێی بفرۆشێت کـە ڕەنگەبـە خەیاڵیشیدا نەیەت.

تاکتیکی پێنجەم: داوای زیادەکردنی شتێکی دیکە

هەندێك جار دەڵێیت،" باشە، بەو نرخە ڕازیم بەڵام دەبێـت بەخۆڕایی بۆم بگەینیتە شوێنی مەبەسـت". ئەگـەر لایـەنی بەرامبەر دوودڵ بوو سەبارەت بە زیادکردنی شـتێکی دیکـە بـــۆ ڕێککەوتنەکـــە، ئـــەوا بەشـــێوازێکی جـــوان و بەڕووخۆشی‌یەوە بڵێ "ئەگەر بەخۆڕایی بـۆم نەگوازیتـەوە ئەوا نامەوێت ڕێکەوتن بکەم، یاخود ئەم شتە بکڕم".

لێرەدا ئەم زیادکردنە وەك کلیلێك وایـە. ڕازی بـە بـەکڕینی ئــەو شــتــەی کەدەتــەوێت و لەســەر نــرخ و مەرجــەکانیش ڕازیبــە، وانیشــان بـدە کـە ڕێکەوتنەکـە تــەواو بووبێــت. فرۆشیارەکە دڵخۆش بێت بەوەی کـە شـتەکەی فرۆشـتووە بــەو نرخــەی کــە خــۆی دەیــەوێت. بــەڵام لەپاشــاندا تــۆ داواکارییەك زیاد بکە بـۆی. ئـەم جـۆرە تاکتیکـە هەمیشـە کار دەکات تەنانـەت ئەگـەر ئـەو شـتەی دەیکڕیـت خـانوو، سەیارە، یاخود بەلەمێکیش بێت.

ئەو وانانەی لەکڕینی خانوویەکەوە فێری دەبین

قایلبوویــت بــەوەی کــە خانوویــەك بکڕیــت بــە نرخێکــی دیـاریکراو. ڕێکدەکـەون لەسـەر نـرخ و کـاتی چـوونت بـۆ خانووەکە، بەڵام بەرلەوەی هیچ شـتێك واژۆ بکـەیت، داوای ئــەوە بکــە کــە فرۆشــتنەکە دەبێــت کەلوپــەلی ناومــاڵ و ئامێرەکـانی ناوماڵەکەشـی تێـدا بێـت هـەر بەهـەمان ئـەو نرخــەی کــە داواکــراوە. زۆر سەرسـوڕهێنەرە کــە چــەندین کەس تەواوی خانوەکەیان دەفرۆشن بە هــەموو کەلوپــەل و پێداویستی‌یەکانییەوە تەنها بە نرخی خانووەکە خۆی.

هاوڕێییەکم خانوویەکی کڕی کە بۆفرۆشتنی داوای ٢,٤ملیۆن دۆلاریان دەکرد. لەپاش شەش مانگ گفتوگۆکردن، لەکۆتایدا خاوەنەکەی ڕازیبوو بەوەی کە بەیەك ملیۆن دۆلار بیفرۆشێت، تەنها بۆئەوەی لەو خانووە ڕزگاریان بێت. لەپاشان هاوڕێکەم کە گفتوگۆکەرێکی زۆر لێهاتوو بوو وتی "بەدڵنیاییەوە، بەهەمان ئەو نرخە هەموو کەلوپەل و کارە هونەری و شتەکانی نێوماڵەکەشم پێدەدەن ، ئەی وانییە؟" هەرچەندە کارە هونەری و کەلوپەلەکانی ناوماڵەکە نرخەکەی زیاد لە ١٠٠ هەزار دۆلار بوو. بەلاّم لەبەرئەوەی خاوەنەکەی زۆر پەرۆشی فرۆشتنی خانووەکە بوو وە دەیزانی کە هیچ جێگایەکی نییە تاوەکو کەلوپەلەکانی لێدابنێت بۆیە وتیان "قیروسیا" و هەموو ئەو شتانەشیان پێدا کە داوای کرد، هەرچەندە خانووەکەشیان بەنرخێکی زۆر کەمتر لەو نرخە فرۆشت کە خۆیان خوازیاری بوون.

# بەشی نۆزدەهەم
# شێوازی ڕۆشتن و بەجێهێشتنی گفتوگۆ

ئەمە بەهێزترین ئامرازە لە گفتوگۆکردندا. لەڕاستیدا نابێت هەرگیز بچیتە نێو گفتوگۆیەکی گرنگ و هەتەرەوە ئەگەرنا دەبێت ئامادەبیت کە بڕۆیت ئەگەر نەتوانیت گرنگترین ئامانجەکانت لە مامەڵەکەدا بەدەست بیهێنیت .لەپێشتردا باسی گرنگیی بژاردەکان و دۆزینەوەی ئەوەی پێویستە کردووە. زۆر گرنگە کە لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنی بەرامبەرت بکەیت، تاکو بزانیت بەڕاستی چییان دەوێت و چییان پێویستە وە کێشەکانیان چین .کاتێک دەچیتە گفتوگۆیەکەوە دەبێت هەموو زانیارییەکت لەلابێت کە پێویستە تاکو بتوانیت بڕۆیت و گفتوگۆکە بەجێبهێلێیت ئەگەر قایل نەبویت بە نرخ و مەرجەکان. گرنگیی بژاردە پەرەسەندووەکان ئەوەیە کە بەپێی بژاردە بچێتە نێو گفتوگۆوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەك تاوەکو لەگەڵ بەرامبەرەکەت ڕازیبێت. کاتێك هیچ بژاردەیەکت نەبێ ئەوا هیچ هەڵبژاردنێکیشت نابێت. وە کاتێك هەڵبژاردنت نەبێت

ئـەوا هـیچ ئازادییـەکیش نابێـت وە هـەتا ئـازادیی زیـاترت هــەبێت لــە گفتوگۆکردنــدا ئــەوا ڕێکــەوتنی باشــتر لەبەرژەوەندیی خۆت ئەنجام دەدەیت .

**ئامادەبە بۆئەوەی بڕۆیت لە هەموو گفتوگۆیەکدا**

لەگفتوگۆکردنـدا، هــەموو کـارێکی شــیاو ئــەنجام دەدەم تاوەکو لـە دۆخێکـدابم کـە هـەرکات بمـەوێت بتـوانم بـرۆم. ئەمە هێزێکی یـەکجار زۆرم پێدەبەخشـێت. ئەمـە هەمیشـە لەوە دڵنیام دەکاتەوە کە باشـترین مامەڵـە ئـەنجام بـدەم. ڕێگە شێوازی ڕۆشتن یاخود بەجێهێشتن بەکاربهێنە کاتێـك ئارەزوو دەکەیت کەمترین نرخ بدەی بـۆ کـڕین وە زۆرتـرین نرخ وەربگریت بۆ فرۆشتن. لە گفتوگۆکردنـدا مـن هەمیشـە دەڵـێم "تــەنها پــێم بڵــێن باشــترین نرخێــك کــە دەتــوانن پێشکەشی بکەن چەندە، یـەکجار، وە منـیش دەڵـێم بـەڵێ یاخود نەخێر، ئەگەر بیکڕم یاخود نا".

سوود وەربگرە (سوودمەندبە)

ئەم جۆرە وشانە دەبنە هۆی لاوازبوون و ترساندنی کەسـی بەرامبــەر. چــاوەڕێی نرخێکــی یــەکجار جیــاواز دەکــەن بۆئەوەی دەستپێبکەن. بەڵام هـەر لەسـەرەتاوە دووچـاری

دوورکەوتنەوە و ڕۆشتنم دەبنەوە کە ئەگەر ئـەو نرخانـەی ئەوا دەڵێن گونجاو نەبن بۆ من. ئەگەر من کڕیاربم، ئەوا بـە فرۆشـیارەکە دەڵـێم " کۆتـا نـرخ چـەندە". بەشـێوەیەکی دیکە ئەو نرخەم پێبڵێ کە لەوە کەمتر نایفرۆشـێت. ئەگـەر پێم گونجاو بێت ئەوا قسەی لەسەر دەکەین. بەڵام ئەگـەرنا ئەوا مـن دەڕۆم و ئـەم مامەڵەیـەش لەبیردەکـەین. زۆربـەی جـار ئـەم شـێوازە دەتگەیەنێتـە نرخێـک کـە زۆر کـەمترە لەوەی لایەنی بەرامبەر دەیویست دەست بـە گفتوگـۆکردن بکات لەسەری.

**دووربکەوەرەوە لە شەڕەقسە و دەمەقاڵێکردن**

بەتایبەتی کاتێك پەلـەم بێـت دەڵـێم بـا قسـە و باسـی زۆر نەکەین تاوەکو نرخم پێبلـێن. خـانوو، ئۆتۆمبێـل، ئـامێرو، کەلوپەل و چەندان شتی دیکـەم کڕیـووە. بـە بـەکارهێنانی ئەم ڕێگا و شێوازە. کاتێـك شـتێك دەفرۆشـم لـە زۆرینـەی گفتوگۆکاندا دەڵێم" ئەمە کۆتا بڕە کە پەسەندی بکـەم وە ئەگەر پەسەند کراو نییە بۆ ئێوە بـا بـزانم." هەنـدێك جـار خەڵکی دەپرسـن " باشـە ئەگـەر کاتێـك بەڕاسـتی بتـەوێت بەرهەمێك بکڕیت، بـەڵام بـەوتنی ئـەوەی کـە مـن دەڕۆم و

گفتوگۆکە جێدەهێڵم، خۆت بەستۆتەوە ئەوە چی دەبێت ؟" زۆر ئاسانە لەبیرت بێت کە ئەم ڕۆشتن و بەجێهێشتنە ڕێگایەکی دیکەی گفتوگۆکردنە. دەتوانیت هەستیت لە ژوورەکە یاخود لە دووکانەکە بێتە دەرەوە وە بڕۆیت و پاشان بگەڕیتەوە بەڵام یاساکە ئەمەیە: هەرگیز ناتوانیت باشترین نرخ بزانیت هەتاوەکو هەڵنەسیت یاخود هەڕەشەی ڕۆیشتن نەکەیت .

وانەکان لە کڕینی ئۆتۆمبێلێکەوە

کاتێك ویستم ئۆتۆمبێلێك بۆ خێزانەکەم بکڕم ڕۆشتین بۆ لای فرۆشیارێك کە ئەو ئۆتۆمبێلەی هەبوو کە خێزانم دەیویست. وە دوو هاوڕێشم لەگەڵ بوو کە شارەزای کڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبێل بوون. لەپاش تەماشا کردن و تاقیکردنەوەی ئەو ئۆتۆمبێلە دانیشتین بۆ گفتوگۆکردن. بەڵام سەرەتا وتم، " کە چەندین ساڵ کار و بازرگانیی ئوتومبێلم کردووە. دەزانم کە نرخی خۆی چەندە و تۆ چەندی وەك قازانج دەخەیتە سەر تاوەکو بەردەوام بیت لە بازرگانییەکەدا. بۆیە تکایە کۆتا نرخ و گونجاوترین نرخم پێبڵێ بۆ ئەم ئوتومبێلە، وە دواتر منیش بڕیاردەدەم کە

ئەو نرخە پەسەند دەکەم و گونجاوە یاخود نا، باشە؟".

فرۆشیارەکە زەردەخەنەیەکی کرد و وتی کە بەتەواوی رازییە بەوە. لەپاشان نرخێکی ٣٠ هەزار دۆلاری پێ گوتم کە من دەمزانی ئەگەر بە ٢٥ هەزاریش پێم بفرۆشێت هێشتا قازانج دەکات.

سەیرێکی ژمارەی نرخەکەم کردوو وتم "زۆر سوپاس ئێستا من ٢٥ هەزار دۆلارت بە کاشی پێدەدەم بۆ ئەم ئۆتۆمبێلە. وە بە هەموو باج و ئامادەکارییەکانیشەوە". بەلأم ئەو سوربوو لەسەر ئەوەی کە ٣٠ هەزار دۆلارەکە کۆتا نرخە کە بتوانیت پێمان بدات. بۆیە من و خێزان و هاورێکانم هەستاین بەرەو شوێنی وەستانی ئوتومبێلەکان رۆشتین. فرۆشیارەکە هات بەدوامانددا و وتی کە دەبێت لەگەڵ بەرێوەبەرەکەی قسە بکات. لەپاش ئەوەی قسەی لەگەڵ بەرێوەبەر کرد گەڕایەوە و وتی کە باشترین و کۆتا نرخ کە داوای دەکات ٢٨٩٩٥ هەزار دۆلارە. دیسانەوە هەستاینەوە و چوینە دەرەوە.

وە دیسان گەڕاندینیەوە، سێ بۆ چوارجار هەمان کارمان کرد. هەتا لە کۆتایدا لەگەڵ بەرێوەبەر و ئەوانەی کە

بــەرپرس بــوون ڕێککــەوتن کەبــە ٢٥ هەزارەکــە پێمــان بفرۆشــن. لــە بــیرت بێــت، هــەرگیز نــاتوانین باشــترین و گونجــاوترین نــرخ بــزانین ئەگــەر نــەڕۆین و شــوێنەکە بەجێنــەهێڵین. پێویســتە بــەردەوام ئــەم بوێرییــە پــەرە پێبــدەیت لەخۆتــدا، هــەتا دەبێتــە شــتێکی ئاســایی و سروشتی بەهرەکانی گفتوگۆکردنت.

## بەشی بیستەم
## گفتوگۆکردن هەرگیز کۆتایی نایەت

دەبێت گفتوگۆکردن وەك پرۆسەیەکی بەردەوام تەماشا بکرێت. هەرگیز گفتوگۆکردن کۆتایی نییە کاتێك زانیارییەکی نوێت پێدەگات، کە بارودۆخت دەگۆڕێت ئەوا بگەڕێرەوە و داوای دووبارەکردنەوەو دەستپێکردنەوەی گفتوگۆکە بکەرەوە. پێشتر باسی "ڕێکەوتنی چینیمان کرد" ئەگەر گفتوگۆ لەگەڵ لایەنی بەرامبەر دەکەیت وە دەتەوێت بەدرێژای چەن ساڵێك بەردەوام بێت ئەم پەیوەندی و گفتوگۆیەتان بەردەوام بیت، ئەوا دەبێت دڵخۆشکردن و قایلکردنی لایەنی بەرامبەرت زۆر لەلا گرنگ بێت. داوا لە لایەنەکەی دیکە بکە کە ئەگەر بارودۆخ گۆڕا وە یاخود چیتر دڵخۆش نین بەوەی کە لە سەری ڕێککەوتون ئەوا دەتوانن بێنەوە و دیسانەوە گفتوگۆ بکەنەوە. هەرگیز لەدوای واژوکردنی ڕێککەوتنێك وا هەست مەکە کە گەمارۆ دراویت یاخود داوت بۆ دانراوە. هەمیشە خوازیاربە کە بگەڕێیتەوە و داوا لەکەسانی دیکە بکە بۆ

گۆڕینی خاڵ و مەرجەکان. لە زۆربەی بارودۆخەکاندا کاتێك گفتوگۆیەکی درێژخایەن، بازرگانە زیرەکەکان بۆ ڕێگایەك دەگەڕێن تاوەکو تۆش تیایدا دڵخۆش بیت وە ڕەچاوی هەموو گۆڕانێکیش دەکەن بەپێی گۆڕانی بارو دۆخ.

پێویستە هۆکارێکی باشت هەبێت بۆ دووبارەکردنەوەی گفتووگۆیەکە

کاتێك دێتەوە و داوای دووبارە گفتوگۆکردنی ڕێککەوتنێك دەکرێتەوە، دڵنیابە لەوەی شتێك پێشکەش بکەیت .هیچ کەسێك دووبارە گفتوگۆیەکی هەتەرت لەگەڵ ناکاتەوە مەگەر بەجۆرێك لەجۆرەکان سوود و قازانجێکی بۆ ئەوان هەبێت. ئەوە بەرپرسیارێتی تۆیە کە بیر لەوە بکەیتەوە دەتوانیت چی پێشکەش بە لایەنی بەرامبەر بکەیت بەرلەوەی پێیان بڵێیت کە بە مەرجێك ڕازیبن کە لە کۆتایدا سودی بۆ ئەمانیش هەیە. بیر لەو سوود و قازانجە بکەرەوە کە دەتوانیت پێشکەشی لایەنی بەرامبەری بکەیت وەك هاندەرێك بۆ دووبارەکردنەوەی گفتوگۆکە و گۆڕینی خاڵ و مەرجەکان. لیستێك لەو شتانە بنوسە کە پێویستە پێشکەشی بکەیت و داوای دووبارە

گفتوگۆکردنەوەکە بکە لەسەر بنچینەی ئەوەی کە سوودی بۆ لایەنی بەرامبەر هەیە.

**برۆ بۆ بانکەکەت**

پێشتر لە کاروباری بازرگانیمدا، توشی شکست و باری دارایی دژوار هاتم. لەپڕ باری ئابوریم داڕوخا، بازرگانیەکەم زیاتر لە سەدا پەنجا دابەزی قەرزی بانکم لەسەر بوو وە نەمدەتوانی چیتر قەرزی مانگانەی بانکەکە بدەمەوە. ئێستا دەبێت چی بکەم؟ بەڵام نهێنییەکی بچوکم دۆزییەوە لەسەر پیشەسازی بانك. ئەگەر قەرزەکان بەرەو خراپی زۆر بچن ئەوا بەڕێوەبەرەکان یاخود فەرمانبەرەکانی بانك دەکەونە کێشەوە لەگەڵ سەرۆکەکانیان. بەڵام دەتوانیت پارێزگاری لە قەرزە کۆنەکە بکەیت بەوەی کە مانگانە بڕێك سوودی زیادەیان بۆ دابنێیت لە کاتێکدا کە بانکەکە سوودەکە وەردەگرێت لەسەر بنەمایەکی پێشکەوتوو. هێشتا قەرزە کۆنەکە دەمێنێتەوە و لە دەفتەری بانکدا دەنوسرێت و هیچ کەسێك توشی کێشە نابێت.

هەر بەم هۆیەوە ڕۆشتم بۆلای بەڕێوەبەری بانکەکەم، بۆب مورای، وە پێم وت کە چیتر ناتوانم پارەی مانگانە بدەم.

بەڵام قەرزە کۆنەکانم هەردەمێینیت بەوەی کە قازانجی زیاتر بدەم ئەگەر لەم بارەدا کە سێ هاوکارم بێت هەتاوەکو بازرگانییەکەم پەرە دەسێنێتەوە. سەرسام بووم زۆر بەخێرایی ڕازیبووەوە لە بەرچاوی خۆمدا قەرزەکانی بۆ نوسیمەوە و هەژماری بڕی سوودی مانگانەکەی بۆ کردم لەسەر قەرزەکە، وە پرسی کە ئایا دەتوانیت هەموو مانگێك ئەو بڕە پارە بدەیت. منیش دڵنیام کردەوە لەوەی کە دەتوانم. بۆیە زۆر سوپاسی کردم و تەوقەی لەگەڵ کردم و وە پەیوەندییەکەمان بە بێ کێشە بەردەوام بوو.

**پەیوەندی بە قەرزدەرەوەکانتەوە بکە**

لەلایەك بازرگانییەکەم توشی کێشە بووە، لەلایەکی دیکەوە ناتوانم پارەی پسوڵەی هەموو قەرزەکانم بدەمەوە. هەزاران دۆلار لە هەژمارەکەدا بوو کە دەبوو بیدەم بۆ چاپەمەنی، کرێ، سوودی زیادە، کەشتیوانی، تۆمارکردن و کاری یاسای و خزمەتگوزارییە بازرگانییەکانی دیکە. لەبارو دۆخێکی یەکجار سەخت و ناخۆشدا بووم. لەبری ئەوەی دوور بکەومەوە لە

پەیوەنـــدیکردن کۆکردنـــەوەی بریکارەکـــان لیســـتێکم دروســتکرد لــە هــەموو قــەرزدەرەکانم، لەپاشــان چــومە ســەردانیکردنی هــەمووپان و ڕووبــەروو هــەمان چــیرۆکم بــۆ هەموویان باسکرد.

پــێم وتــن" لــەم قەیرانــە ئابوورییــەدا بازرگانییەکــەم لــە مەترســـییەکی گەورەدایـــە. بـــەڵام لـــەکۆتایی تونێلەکـــە ڕووناکییەك هەیــە کــە دەتــوانم بیبیــنم وە دەتــوانم هــەموو ئـــەوەی کـــە قـــەرزدارتانم بۆتـــان بگێڕمـــەوە بەســـوودی زیــادەوە.بــەڵام ئەگــەر بــەردەوام بــن لەســەر پەیوەنــدیی پێــوەکردنم و ســووربن لەســەر ئــەوەی پارەکــە بــدەم ئــەوا کۆمپانیاکـــەم دادەخـــەم و مایـــەپووچ دەبم و دەرۆم. وە ئێوەش تەنانەت یــەك دینــار وەرنــاگرن ئێســتا دەتانــەوێت چی بکەن ؟" دووبــارە زۆر سەرســام بــووم وتیــان "ئەگــەر دەڵێیت کە مانگانە بڕێــك ســوودی زیاترمــان بــۆ دادەنێیــت ئەوا دەتوانین پارێزگاری لە قەرزە کۆنــەکانت بکــەین. لــەم دۆخــەدا بــەردەوام دەبــین لــە کــارکردن لەگــەڵت هــەتاوەکو بازرگانییەکـــەت گەشـــە دەکاتـــەوە و دەتوانیـــت پارەکـــە بەتـــەواوی بگەڕێنیتـــەوە"مـــن وتم، ئـــەوانیش وتیـــان، وە

ئەنجامماندا، لەماوەی شەش مانگدا بازرگانییەکەم گەشەی سەندەوە و هەموو ئەو پارەیەی کە قەرزاربووم گەڕاندمەوە بۆ خاوەن قەرزەکان.

ئەگەر کەوتویتەتە بارێکی خراپەوە بەهۆی ئەو گفتوگۆیەوەکە لە ڕابردوودا ئەنجامتداوە یاخود بەهۆی ئەو کارانەی ئەنجامتداوە و ناتوانیت تێچووەکەی بدەیتەوە، ئەوا هیچ دوودڵ مەبە و مەترسە لەوەی کە بگەڕێتەوە و داوای گۆڕینی خاڵ و مەرجەکان بکەیتەوە. ئەگەر ماقولان چارەسەرێکی گونجاو پێشکەش بکەیت. ئەوا زۆر سەرسام دەبیت بەوەی کە لایەنی بەرامبەرت چەندە ماقولّ و گونجاو دەبن لەگەڵت.

# بەشی بیست و یەك
# کەسانی گفتوگۆکەری سەرکەوتوو

نیيشـانەکانی گفتوگۆکـەری سـەرکەوتوو چـییە و چـۆن دەتوانیت بڵێیت کە تۆ یەکێکیت لەو کەسانە؟

ئەگەر سەرنج بدەیت لە گفتوگۆکەرە سەرکەوتووەکان ئـەوا چەندین تایبەتمەندیی و کرداری هاوبەشیان هەیـە. یەکـەم، ئـەمان گفتوگـۆکردن بەپرۆسـەیەکی هەمیشـەیی دەبیـنن. هــەرگیز کۆتــایی نایــەت ژیــان وەك پرۆســەیەکی چارەسەرکردن و ڕێکخسـتنی کێشـە و ململانێکـان دەبیـنن کـە ڕۆژانــە و بــەردەوام ڕوودەدەن لــە هــەموو بوارێکـدا. پرۆسەیەکی بردنەوەی دوولایەنەیە، بەڵام ئەم دەرئەنجامـە هەندێك جار نـە پێویسـتەو نـە خوازراویشـە. گفتوگۆکـەرە بــاش و ســەرکەوتووەکان کەســانی مێشــك کــراوەو خۆگونجێنن، بۆ بارودۆخـە گۆڕاوەکـان. گفتوگۆکـەرە کـەم ئەزموون و لاوازەکان تەنها یەك بیرۆکە لە هزریاندا دادەنێن تــەنها لــەپێناو ئــەو بیرۆکەیــەدا دەجــەنگن ئەگــەر بارودۆخەکەش بگۆڕێـت. گفتوگۆکـەری بـاش نـەرمونیانن و

خێران لە ناسینەوە و دۆزینەوەی مەبەست و ئامانجەکانی هەردوو لایەن لە گفتوگۆکەدا. خوازیاری گۆڕانکارین ئەگەر زانیارییەکی نوێ پێشنیار بکرێت کە بیرۆکەیەکی باش بێت و سودی بۆ هەردوو لایەن هەبێت.

کەسانی بەهەڵوێست و یارمەتیدەرن نەوەك کەسی بەرهەڵستیکەر و شەڕانگێز. بەشێوەیەك لە گفتوگۆکردن ناڕوانن کە ئەمە وەك جەنگێکە و خۆیان وەك ئەوە نابینن کە لە ڕوبەڕووبونەوە و شەڕدابن .گفتوگۆکەرە نایابەکان زیاتر کەسانی دروستکەر و داهێنەرن نەك پێشبڕکێکار. لەبری ئەوەی کە تەنها هەوڵی بردنەوە بدەن، بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕێن کە هەردوولا تیایدا دڵخۆش بن. کۆتایی و گرنگترینیان ئەوەیە کە کەسانی بەکارهێنەر نین، هیچ فێڵ و تەڵەکەیەك بەکارناهێنین تاوەکو لایەنی بەرامبەر بخەنە دۆخیکی دۆڕاوە و خۆیان براوە بن. لەگفتوگۆکردنی یەکجاردا( بۆ یەکجار ڕوو بدات)، گفتوگۆکەری باش هەموو شتێکی شیاو دەکات تاوەکو باشترین ڕێککەوتن بەدەست بهێنێت. بە تێگەیشتن لەوەی ئەم گفتوگۆیە تەنها بۆ یەکجارە. مەرجەکان هەرچی بن کە

له سەری ڕێکدەکەون، ئـەوا ئـەو دوولایەنـە جـارێکی دیکـە گفتوگۆناکەنەوە، ئامانجەکە ئەوەیە کـە باشـترین ڕێکـەوتن ئـەنجام بـدەن بـۆ ئـەو یـەکجارە. هەرچـۆنێك بێـت، ئەگـەر دوولایەنەکــە جــارێکی دیکــە گفتوگۆیــان کــرد و کاریــان پێکەوە کردەوە، ئەوا گفتوگۆکەرە سەرکەوتووەکان بیرلـە گفتوگۆ و دانیشـتنی داهـاتووتر دەکەنـەوە بەرلـەوەی ئـەم گفتوگــۆی ئێســتایان بــەکۆتا بگــات. بیرکردنــەوەکانی گفتوگۆکەرەکە دەبێت مەودا درێژ و دێژخایەن بن.

لــە هــەموو ســاڵەکانی گفتوگۆکردنمــدا نەمبیســتووە کــە گفتوگۆکــارێکی زیــرەك ڕێککــەوتنێکی ئــەنجام دابێــت و سەرکەتوو بووبێت لە ئەنجامی بەکارهێنانی فێـڵ و تەڵەکـە بەجۆرێك لە جۆرەکان. چـەندین کتێـب و کـۆرس هـەن کـە چـۆنییەتی بـەکارهێنانی فێـڵ و تەڵەکـەت فێردەکـەن وەك "پێچـەوانەکردنەوەی ڕۆڵـەکان"وە تەکنیکـەکانی "کەســی باش و / کەسـی خـراپ" کـە تیایـدا هەوڵـدەدەیت لـەڕووی دەروونییـەوە فێـڵ لـە خـەڵکی بکـەیت بـۆ بڕیـاردان .ئـەم شـێوازانە بەدەگمـەن کـار دەکـەن و لەڕاسـتیدا سـوودیان دەبێـت. ئـەوە ڕاسـتگۆیی دادپـەروەری ژنـان و پیـاوانی

دڵسۆزن بە بیرۆکەی ڕوون، ئەوەی دەیانەوێت بەدەستی دەهێنن و مامەڵەیەك دەكەن كە هەمووان حەز بە بەردەوامی بکەن و تیایدا ئاسودەبن. پێویست ناکات بۆئەوەی گفتوگۆکارێکی سەرکەوتووبیت ببیتەکەسێکی بەکارهێنەر و فێڵباز. لەبری ئەوە دەتوانیت ڕاستگۆ و دادپەروەر بیت و بەتەواوی ڕون بیت سەبارەت بەوەی کە دەتەوێت، پاشان بەدوای باشترین ڕێگەدا بگەڕێت بۆ بەدەستهێنانی لە وتووێژەکانتدا لەگەڵ لایەنی بەرامبەردا.

**چوار کلیلە بنچینەیی و پێویستەکە**

لەبیرت بێت کە گفتوگۆیەکی سەرکەوتوو لەسەر بنچینەی چوار شتی گرنگ دامەزراوە. ئەگەر ئەو چوار کلیلەت لەبیربێت ئەوا دەبیتە گفتوگۆکارێکی نایاب و بەو شێوەیەش دەمێنیتەوە:

١- ڕاستییەکان بەدەست بخە و پێشتر ئامادەکاری بکە. هێز، هەمیشە لای ئەو کەسەیە کە زۆرترین زانیاری، زۆرترین بژاردە و باشترین جێگرەوەی هەیە. پێشتر خۆت ئامادە بکە، هەموو ئەوشتانە فێرببە و بزانە

سەبارەت بە ویست و پێویستی و بارودۆخی لایەنی بەرامبەرت.

٢- بپرسە لەوەی چییت دەوێت. بپرسە لە ڕێگای سەرکەوتنت. بڵێ"بەرلەوەی دەست بەکاربین، دەمەوێت پێتان بڵێم کە بەڕاستی لەم گفتوگۆکردنە دەمەوێت چیم دەست بکەوێت ". هەرگیز مەترسە لەوەی داوای زۆر بکەیت کاتێك دەچیتە گفتوگۆیەکەوە، بەتایبەتی لەسەر نرخ و خاڵ و مەرجەکان، لەبەرئەوەی ئەمانە چەند پێکهاتەیەکن کە دەکرێت گفتوگۆیان لەسەر بکرێت و بگۆڕێن.

٣- بەدوای چارەسەرێك بگەڕێ کە هەردوو لا تیایدا براوەبن. لە ئامادەکاری بۆ ڕێککەوتنێکی بەردەوام و درێژخایەن، هەوڵی بردنەوە مەدە یاخود ڕێککەوتنێك بکەیت کە تەنها سوودی لایەنی بەرامبەری تێدا بێت. یان ڕێککەوتنی دوولا براوە بکە یاخود ڕێککەوتن مەکە. لەبیرت بێت ژیان دوورودرێژە وە ئەوەی کە ئەمڕۆ دەیکەیت سبەی دێتەوە ڕێگات. ئەگەر ڕێککەوتنێك بکەیت کە زیان بەلایەنی بەرامبەر

بگەیەنیت، ئەوا دەکرێت توشی خۆت بێتەوە لە کارەکانتدا و باجەکەی بە زیاتر لەوە بدەی کە دەستتکەوتووە.

٤- مەشق بکە، مەشق بکە، مەشق بکە. لە هەموو دۆخێك و لەهەموو دەرفەتێکدا گفتوگۆ بکە. لەکاتی کڕینی خانوو، سەیارە، کەلوپەل، جلوبەرگ یاخود هەرشتێکی دیکە، دڵنیابەرەوە لەبەهرەکانی گفتوگۆکردنت و مەشق بکە. تواناکەت بۆ گفتوگۆکردن کە تەنها لە ئەنجامی مەشقی بەردەوامەوە پەرەی پێدەدرێت، دەتوانیت لەسەدا بیستی هەموو ئەو شتانەت بۆ بپارێزێت کە دەستت دەکەوێت یاخود خەرجی دەکەیت بەدرێژایی ژیانت. بە بەهرە باشەکانی گفتوگۆکردن دەتوانیت پارەکەت، کاتەکەت وە وزەو تواناکەت بپارێزێت. وە دەتکاتە کەسێکی کاریگەر و سەرکەوتوو لەژیانی بازرگانی و کەسیتدا.

گفتوگۆکارێکی سەرکەوتوو لە لەدایکبونەوە لەگەڵیان نەبووە، بەڵکو خودی خۆیان دروست دەکەن. هەواڵە

باشەکانیش ئەوەن کە دەتوانیت ببیە باشترین گفتوگۆکـەر بەکۆشـــش کـــردن و خوێندنـــەوەی ئـــەو بابەتانـــە و جێبەجێکردنی ئەو شێواز و ڕێگایانەی کە لەم پەرتووکـەدا فێریان بوویـت، وە بـە مەشـقکردنی ئـەو ڕێگـە و شـێوازانە بەردەوام و بەردەوام تا دەبنە بەشێك لە سروشـتی خـۆت. وە دەرفــەتی تــەواوت دەبێــت بــۆی چــونکە گفتوگـۆکردن پرۆسـەیەکە بەدرێـژایی ژیـان بەردەوامـە و هـەرگیز کۆتـای نایەت.

بەختێکی باش!

